



**ناوی ڕۆمان: محەمەدی دوزجەیی**

**نووسەر : خالید ئێرتوغروڵ**

**وەرگێڕ : گۆنا غەریب**

**داڕشتنەوەی و پێداچوونەوەی: أحمد طاهر**

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان**

**ژمارە (٧١٣)ی ساڵی ٢٠٠٧ ی پێ دراوە**



ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

بنکەی سەرەکی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا – سلێمانی / شەقامی پیرەمێرد

0770 358 7100 - 0750 106 9589 - 0748 013 4669 ara.m@hotmail.com

# پێشەکی

لەم سەردەمەماندا، یەکێك لە گرنگترین کێشە و پرسەکانی کۆمەڵگاو خێزانەکان: (کێشەکانی گەنجێتییە). هەموو خێزانێك کەم یان زۆر ئەم کێشەیەیان هەیە. ئەو کەسانەی کە چاوەڕوانییەك، سوودێك یان ئامانجێکیان لە کۆمەڵگا هەیە، بۆ گەیشتن بەم ئامانجەیان بەزۆری گەنجەکان بەکاردەهێنن.

هەر لەبەرئەمەشە کە گەنجان بەرەو جۆرەها زیان و خراپەکاری کەمەندکێش دەکرێن و تێوە دەگلێنرێن..

لە خواردنەوەوە بگرە تا بەکارهێنانی ماددە بێهۆشکەرەکان، لە نکوڵیکردن لە بەدیهێنەرەوە تا ئایدیا نەزۆکەکان، لەدونیای تاریکەوە تا ڕابواردنی ئاشکرا، هەریەك لەمانە جۆرە چالاکییەکی زیانبەخشن کە بەدەستی گەنجەکان بەڕێوەدەبرێن، بە کورتی کۆمەڵگا و خێزانەکان تا ئەوپەڕی سنوور گیرۆدەی گرفت و کێشەی گەنجانیانن و لە ئاستیاندا شپرزەن.

لەم ڕۆژگارەماندا، دوو مەترسی ئاشکرا چاوەڕێی گەنجانن:

یەکێکیان: تەوژمی ئینکاریکردن و بێ باوەڕی.

دووەمیشیان: بێ ئامانج بوون یان بێباکی و بێ یاسایی و بیرۆکەی (بەمن چی)یە یە. هەردووکیشیان دوو پێشهاتی ئەوتۆن کە کرۆکی کۆمەڵگا و ئاسایشی وڵات سەرەو ژوور دەکەن. لەبەرئەمە یەکێك لەگرنگترین کێشەکانی ئەمڕۆمان ئەوەیە گەنجێك کە ئیمانی لەدەستداوە و لە ژیان تۆراوە و لە کۆمەڵگا یاخی بووە، ئەمە چۆن بگەڕێندرێتەوە ئامێزی کۆمەڵگا و چاکسازی لەتەکدا بکرێت؟! وا ئەم کتێبەی بەردەستتان، (محەمەد دوزجەیی) چارەسەرەکانی ئەم کێشەیە و ڕێگەکانی ڕزگاربوون لێی نیشان دەدات. محەمەدی دوزجەیی بەسەرهاتی گەنجێکی نێو گێژاوی بێباوەڕی و بەرەڵایی دەگێڕێتەوە، کە تا ئاستی زیان گەیاندن بەکۆمەڵگا سەری دەکێشا، دواتریش چۆنیەتی ڕزگاربوونی باس دەکات و، چەندەها ڕووداوی بێدارکەرەوەی پڕ لەپەندمان پێشکەش دەکات. لەساتەوەختەکانی خوێندنەوەی ئەم کتێبەدا کە سەرانسەر ڕووداوێکی ڕاستەقینە دەگرێتەخۆ، هەم چارەسەری کێشەکانی گەنجان دەدۆزیتەوەو هەم لە تاسەو جۆش و خرۆشی ڕووداوەکانیدا ئەسرینەکانت پێ ڕاناگیرێن، لەڕێگەی ڕووداوەکانی زانکۆو لەڕێگەی بومەلەرزەکەی دوزجەوە، محەمەد دوزجەیی چەندەها ڕووداوی لەیادنەچووتان پێدەبەخشێت، بە هیوای سوود پێگەیاندنتان..

نووسەر

٢٠٠٠/٥/١٥

# ساڵی نوێی خوێندن دەستی پێکردەوە

مامۆستابووم ...

تازە قوتابخانە و زانکۆکان کرابوونەوە ...

لە بیستەمین ساڵی ژیانی پیشەییمدا بووم، لەگەڵ هەرجارێکی کردنەوەی قوتابخانەدا، سەرلەنوێ لەنێو ئەو خۆشی و کەیفە بێ ئەندازەیەدا دەژیام، بەتامەزرۆیی دووبارە لەهەرێمەکەمدا دەژیام. ئەمە جۆرە چێژو خۆشییەکە باسکردنی بۆکەسێك کە مامۆستایەتی نەکردبێت کارێکی ئەستەمە. بێجگە لە مامۆستا هەرگیز هیچ کەسی دی لەمانای حەسرەت و یادکردنی خوێندنگا و، هاوپیشەکان و قوتابییان تێناگات. قوتابخانەو مامۆستا و قوتابی، هەرگیز لەیەکتری دانابڕێن و جیانابنەوە. ناتوانرێت بەشێوەیەکی جیا بیریان لێبکرێتەوە، هەموویان تەواوکەری یەکترن و دابڕینی یەکێکیان لەوی تریان کارێکی مەحاڵە ئەمەش لێکدانەوەیەکی ماددی نییە، ئەمە مامەڵەیەکە، ئەوینداریيەکە، حەسرەتێکە، دڵێکە، ئیکسیرێکی شادی بەخشە. جا ئەبێت قوتابی بۆ مامۆستا چی نەبێت؟!! قوتابی بۆ مامۆستاکەی خۆشی ژیانی و خۆڕاگریی ژینە، کە وەك پارچەیەکە و هەرگیز لێی جیانابێتەوە. جا کاتێك مامۆستایەك لەم کەشە دادەبڕێت، ئەوا دونیاکەی ڕووخێنراوە.

مامۆستای شاعیر مەگەر لەخۆڕا گڕی گرتووە؟! کە دەڵێت:

ئـــــــەوان هـــــــەموو شـــــــتێکی مـــــــنن

ئـــــــاوی ژیـــــــانم، نـــــــانم

لەگوڵـــــــدانی دڵمـــــــدا کـــــــراوەن

ڕەنـــــگ، ڕەنـــــگ، نەخشـــــە، نەخشـــــە

گوڵـــــــە بـــــــۆن میســـــــکەکانم...

ئـــــــەوان هـــــــەموو شـــــــتێکی مـــــــنن

دوعاکـــــــانم، ئاواتـــــــەکانم

ئـــــەی خودایـــــە جیـــــام مەکـــــەرەوە

ئەوانـــــــە فریشـــــــتەی مـــــــنن

لەژیانی مامۆستاییمدا بۆ بیستەمین جار بەهەمان پەرۆشی و هەمان هەستەوە بەکۆلیژ و قوتابییـەکانم شـادبوومەوە. ئـەو خۆشـییەی کـە باس کردنی مەحاڵە کاریگەریی ئەوەندە مابووەوە، بێ ئـەوەی ئاگـام لەخۆم بێت هەروەك ئەوەی کە بمەوێت هەموو قوتابییـەکان بـەجارێك لەباوەش بگرم، کە چوومە کۆلێـژ هەستم بەکردنـەوەی ئـامێزم کـرد، هـەروەك بڵێـی لـەو کاتـەدا هـەموو ئـازار و ناڕەحـەتی و خەمـەکانم کۆتاییان هاتووە، کەسێك کـە لـەو کـەش و هـەوا ئەفسـوناوییەی ئـەو کۆلێژەدا ژیابێت، ئایا دەتوانێت لـە جێگەیـەکی تـردا بـۆ نـان و ئـاو و هەوا و خۆشی بگەڕێت؟؟

دووباره هەروەك مامۆستای شاعیر دەڵێت:

مـــــن لـــــه قوتابخانـــــەدا لـــــەدایکبووم

لەگـــەڵ گـــوڵ و گوڵەباخەکانـــدا گـــەورە بـــووم

لەگـــەڵ ئەوانـــدا گریـــام، لەگەڵیانـــدا پێکـــەنیم

ئـــەو دەســـتانەی کـــە بـــۆ خـــوا بـــەرز دەکرێنـــەوە

هەســـــته پاکـــــەکانی نـــــاو دەروونیـــــان

ئـــا ئـــــەوەتا، ســـــەرمایەی مـــــن، خـــــەڵاتم

ئـــەی ئـــەو منداڵانـــەی کـــە فێـــرم کـــردوون

لەســـەر کێلـــی گۆڕەکانـــدا بنوســـن (مامۆســـتا)،

بـــــەڵکو بـــــێن و دوعـــــا بکـــــەن...

## هەر لە یەکەم وانەدا، ڕووداوێکی سەیر

بە سەرلەنوێ ژیانەوەی ئەم هەست و نەست و سۆزانەوە، خۆمم لەیەکەم وانەمدا بینییەوە. گەنجە خوێن گەرمەکان کە تـازە لـە زانکۆ وەرگیرابـوون، لەچـاویاندا بریسـکەیەکی شـەرمنی و بـێ ئارامییـەکی شیرین و، خرۆشی بوونە خوێندکاری زانکۆ دەخوێنرایەوە، ئەم پۆلەی کە لەپەنجا قوتابی پێکهاتبوو زیاتر لـە نیوەیـان کـوڕ بـوون و ئـەوانی تـریش کـچ. سـەرەتا خـۆمم پـێ ناسـاندن، بـۆ ڕەواندنـەوەی نـامۆیی خوێندکارەکان دەستپێکێکم پێشکەش کرد، بەباسکردنی قوتابخانە و

خوێندن و گرنگیی بەدەستهێنانی زانکۆ لەم سەردەمەدا. هەوڵمدا ڕێزێك بەقوتابییەکان ببەخشم، بەتایبەتی باسی ئەوەم بۆکردن کە پێویستە نە لە وانە و نە لە تاقیکردنەوەکان نەترسن، ئەگەر بە ڕێکوپێکی و بە بەردەوامی هەوڵبدەن سەرکەوتنێك بەدەست دەهێنن لەسەروو ئەوەی کە خۆیان چاوەڕێی دەکەن. بەهۆی ئەم گفتوگۆیەوە بینیم کە قوتابییەکان، ئەگەر بەشێکیشیان بێت، لەم ئەندێشەو سەغڵەتییە ڕزگاریان بوو. پاشان قوتابییەکان یەکەیەکە خۆیان ناساند، هەرقوتابییەك ناو، نازناوی خۆی وت و وتیشی کە خەڵکی چ شارو ناوچەیەکە، هەروەها باسی ئەوەی کرد کە بۆچی (مامۆستایەتی) هەڵبژاردووە.

لەکاتی خۆناساندنەکەدا، قوتابییەك کە ناوی خۆی وت، ناوی محەمەدی دوزجەیی بوو، بالآبەرزو کەمێك پێستی ئەسمەر، قژی لەدواوە بەستبوو، گوارە لەگوێ، لەمل و قۆڵیدا خشڵی زنجیر هەبوو، سەرنجی ڕاکێشام. جل و بەرگەکەیشی ڕەنگی زۆر نامۆبوو، دیاربوو کە بەتەرزێکی نامۆ دوورابوو. لە دەم و چاویدا، لە ئاوازی قسەکردنەکەیدا هەستت بە سەرکەشیو زبرییەکی ئاشکرا دەکرد، کە ئەمە سەرنجی هەموو پۆلەکەی ڕاکێشابوو. دوای خۆناساندن، هەروەك لەسەرەتای هەموو ساڵێکدا ئەنجامم دەدا بۆ باسکردنی ئەوەی کەچیم لەخوێندکاران دەوێت و چاوەڕێی چییان لێدەکەم، دووبارە چوومەوە لای مێزەکەم و دەستم بەقسە کردو وتم:

"هاوڕێیان... دەمەوێت زۆر بە وردی گوێم لێڕابگرن، بەدرێژایی ئەم وەرزەی خوێندن و دەربارەی سیستەم و پابەندی پۆل هەندێك یاسا دائەنێین، ئەو بنەمایانەش كە پێكەوە دایاندەڕێژین دەیخەینە سەرشێوەی نووسراوێك و هەموو قوتابییەك واژووی خۆی لەخوارەوە دەكات. هەموو پێكەوە بەبێ دەستبەرداربوون لەم بنەمایانە پەیڕەویان دەكەین. بنەماكانیش ئەمانەن: ئەو كەسەی پێنج خولەك لەوانە دوابكەوێت ناكرێتە ژوورەوە، پاش بەكاربردنی مافی دەوام نەكردنی مۆڵەت دراو، تەنها بۆ یەك جار مۆڵەتێكی زیادەی دەدرێتێ، پێكەوە وانە ئامادە دەكەین، پێكەوە شی دەكەینەوە و تاوتوێی دەكەین. تاكو مۆڵەت وەرنەگیرێت نابێت قسە بكرێت. كاتێك یەكێك لەپۆلدا قسە دەكات، هیچ كام لە قسە پێ‌بڕین، خۆتێهەڵقورتاندن و، كاردانەوەی ڕەق یاخود بوونە بەربەست لەبەردەم گوێ نەگرتنی كەسانی دیدا ڕوونادات. بۆ هەر بیروبۆچوونێك و شیكردنەوە و هەڵسەنگاندنێك ڕێز دادەنرێت. دەرگای ڕەخنەگرتن بۆ هەموو كەسێك كراوەدەبێت. بەهۆی ڕەخنەگرتنەوە قسەی ڕەق ناكرێت و هەركەسێك نارەحەتییەك یان كێشەیەكی هەبێت، لە بابەتێكی ماددی یاخود مەعنەوی دەبێت بە مەبەستی یارمەتی، هاوڕێكانی یاخود مامۆستاكەی ئاگادار بكاتەوەو دەستەی لێكۆڵینەوە پێكدەهێنرێت.

كتێب خوێندنەوەو ڕاڤەكردن و شیكاركردن ئەنجام دەدرێن. ئەوكەسانەی كە بڕیارەكان پیادە ناكەن بە كۆی دەنگی پۆل سزا

دەدرێن. هەروەها ئەو قوتابییانەی کە سەرکەوتوو دەبن بە کۆی دەنگ خەڵات دەکرێن و بڕیارەکانیش بە ڕای زۆرینە دەدرێت. دەمەوێت بەباشی ئەم بڕیارانە هەڵسەنگێنین و بڕگە بەبڕگە تاوتوێی هەرهەموویان بکەین، ئەوانەیان کە بەگونجاویان نازانن، ئەگەر پێویست بێت، دەتوانین لایان بەرین یاخود بڕگەی تریان بۆ زیاد بکەین، ئەو ماددانەی کە هەموو پێکەوە هاودەنگین لەسەریان بەشێوەی نوسراو دەیاننووسین و ئیمزای هەمووتان وەردەگرم، دەڵێن چی؟

هەندێك لە قوتابییەکان، لەوانەیە ئەمە یەکەم جاریان بووبێت کە ڕووبەڕووی حاڵەتێکی وا بووبنەوە، بێدەنگییەکی دیاریان پێوە دیاربوو، بەبێ ئەوەی دیار بێت کە چ جۆرە کاردانەوەیەك لە مێشکیاندا دروست بووە. محەمەد دوزجەیی کە لە ڕیزی ناوەڕاستدا دانیشت بوو، قژێکی درێژو دیمەنێکی زبری هەبوو، بێ مۆڵەت وەرگرتن هەستایە سەرپێ و وتی: (هەموو ئەمانە شتانێکی بێکەڵکن، ئەمە قوتابخانەی ناوەندی نییە، ئەمە زانکۆیە. مەگەر لێرەش لەسەر ئەم سیستەمە بێ کەڵکانەی ڕێکوپێکی یاساو بنەماو ڕێسا بەردەوام دەبین؟ ئێمە هاتووین بۆ ئێرە کە بەسەربەستی بخوێنین و بژین، ئەو شتەی کە زۆر ڕقم لێی دەبێتەوە و لێی بێزارم، ژیانە بەیاساو قەدەغە کراوەکانیەوە). دەنگی زیاتر بەرزکردەوە و وتی: (من هەرگیز ئەمانە قبوڵ ناکەم، یاساکان من دەکوشن و ئاسوودەییم لەناو دەبەن. ئەگەر

من سەغڵەت بکەن و نوقمی ناو یاساکانم بکەن ئەوا تەنانەت بۆ یەك ڕۆژیش لێرە نامێنمەوە) .

وای دەزانی بەمە کاری کردووەتە سەر دەوروبەرەکەی، بەهیوای هاوکاری کردنی چاوێکی بەدەوروبەریدا گێڕاو درێژەی بەقسەکانیدا: "وابزانم کە هاوڕێیانیش هەمان بۆچوونیان هەیە"، محەمەد هێشتا بەرپەرچدانەوەو پەڵپە ڕیزکردووەکانی تەواو نەکردبوو؛ قوتابییەکی تریش کە لەدوای دواوە دانیشتبوو بەهەمان شێوە بەڕەقییەوە وتی:

"هاوڕێ، ئێمەش مەکە بەئامرازی بۆچوونە ناچزەکانی خۆت. لەهەر شوێنێك کە مرۆڤی تێدا بژی بنەما و ڕێساش هەیە. ئێرە شاخ و کێو نییە. ئەگەر ڕێسا و بنەما و یاسا نەبێت چۆن ڕێکی و پابەندی خوێندن پێك دێت؟"

قوتابییەکی تریش هەڵیدایە و وتی:

" لە وڵاتدا دیموکراتی هەیە و بڕیارەکان بەهاوبەشی دەدرێن، لەڕاستیدا پێشنیاری مامۆستاکەشمان هەروابوو، هیچ کەس بەپێی کەیف و ئارەزووی خۆی حوکمی دەوروبەری ناکات و بڕیار نادات".

قوتابییەکی کچیش ڕەخنەی گرت و بەمەش بۆچوونێکی تری پێکهێنا: " تۆ مافی هیچ ڕەخنەیەکت نییە، سەیرێکی خۆت بکە، بەپێی ویستی خۆت لەبەردەکەیت و قسە دەکەیت. ئەی ئێمە کە ناچار دەکرێین سەرمان ڕووت بکەین؟ لەم بابەتەدا ئەوەی کە پێویستە قسەبکات ئێمەین نەك ئێوە".

محەمـــەد دوزجـــەیی ئـــەو خوێنـــدکارە ڕیزپـــەڕە، بەرامبـــەر ئەوکاردانەوەیەی کە چاوەڕێی نەدەکرد سەرسام مابوو. لەکاتێکدا کـە چاوەڕێی پاڵپشتی و هاوکاریی دەکرد لە قوتابییـەکان، کەچـی یەکـەم کاردانەوەی لەوانەوە بینی. لەو بەرپەرچدانەوە سەخت و زۆرانەی کـە لەڕاست و چەپیەوە بەرامبەری دەکران من فریای ئەو کەوتم.

هاوارم کرد و وتم: "هاوڕێیان، لەپێشدا هەمووکەسێك لەجێی خۆیدا دابنیشـێت و گـوێ لـەمن بگرێـت". بەمـەش شـپرزەیی پۆلەکـە وەستایەوە، منـیش دەسـتمکرد بەقسـەکردن: "ئێسـتا لـەوە دەچـێت بەباشـی تێگەیشـتبن کـە بۆچـی دەمویسـت هەنـدێك یاسـا لەپۆلـدا پێکبهێنم. چونکە ژیانی بێ یاسا پشێوی و پاشاگەردانی و بێزاربوونی تێدایە. ئەگەر یاساکان لەشوێنی خۆیانـدا پیـادە بکـرێن هـیچ کەسـێك ڕێگـە لـەژیانی کەسـێکی تـر ناگرێـت و دەسـت بەسـەر ژیـانی کەسـدا ناگرێت، بەپێچەوانەوە، ئەگەر یاسـاکان بـەجوانی پیـادە بکـرێن ئـەوا شێوە ژیانێکی ئاسوودە و بـەختیارو ڕێکوپێـك و پـڕ یاسـا دەسـتەبەر دەبێت".

بە گۆڕینی بابەتەکە بەردەوام بووم لەسەر قسەکردن:

"دەبینم کە لەئاست قسـە کـەمێك ڕەقـەکانی محەمـەد دوزجـەیی و دەربڕینـە ڕاشـکاوەکەیدا ناڕەحـەت بـوون و ڕانـەهاتوون، ئێـوە ئـەو هاوڕێ بەڕێزانەن کە هاتوون بۆ زانکۆ و چاوەڕێی ئەوەم لێدەکردن کە لەم بابەتەدا زیاتر تێگەیشتووبن".

یەکێك لەقوتابییەکان هەڵیدایە و وتی: "مامۆستا، یانی ئێوە ئەم هەڵسوکەوتەی محەمەدتان پێ درووستە؟"

ئەو لایەنەی کە من دەمەوێت ئێستا بیگەیەنم و پێم خۆش بووە، هەڵسوکەوتەکەی محەمەد نییە، ئەوەی کە دەمەوێت باسی بکەم ئەمەیە: کە لەپۆلدا هەموو قوتابییەك پێویستە زۆر بەئاسایی باسی خۆی بکات و بیروڕاکانی خۆی دەربڕێت، پێویستە بتوانێت ئەو لایەنانەی کە بڕوای وایە سوودیان هەیە شییان بکاتەوە. تەنها بەم شێوەیە دەتوانرێت خاڵە جێناکۆکەکان ڕوون بکەینەوە، بەم جۆرە کەسەکان چاکتر دەناسرێن و بەگفتوگۆکردن کێشەکان ئاسانتر چارەسەر دەکرێن و دەگەنە ئەنجام.

پێویستە لەمەودوا زیاتر ڕابێین لەگەڵ ئەوەدا کە ڕاڤەکردنی جیاواز و نرخاندنێکی جیاواز و تێڕوانینی هەمەجۆر لە مەڕ ڕووداوەکان زۆر ئاسایی و سرووشتییە.

تێڕوانینی جیاواز، جیاواز بوون و بیرکردنەوەی جیاواز دەبێتە هۆی هێنانەدی زیندوویێتی و جووڵە و تازەگەرێتی و زیاتر لە ڕێگەچارەیەك دێتە ئاراوە، زانکۆکانمان کە هێلانەی زانستن زۆر پێویستیان بەمە هەیە، ئەگەر هەزار کەس وەك یەك بیربکەنەوە وەك یەك کەس وان، لەبەرئەوە پێویستە لەم پۆلەدا هەموو کەس زۆر بەئاسوودەیی قسەبکات. پێویستە فێربێت کە لەبەرامبەر ئەوەی کە قسە دەکات بەئارام بێت و ڕێزی لێبگرێت.

ڕاستەوخۆ سەیری ڕیزی ناوەڕاستم کرد، محەمەد دوزجەیی لەحاڵەتێکدا بوو کە سەری داخستبوو و دانیشتبوو لەناکاو سەیری چاوی یەکترمان کرد و نیگاکانمان تێك ئالان، لەدەموچاویدا دیاربوو کەزۆر دڵی خۆشە بەم قسانەم، لەکاتێکدا کە چاوەڕێی ئەوەی دەکرد کە بەشێوەیەکی زۆر ڕەق بەرامبەر بەڕەخنەکانی بوەستمەوە، بەڵام کە پشتگیرم کرد دڵی زۆر ئاسوودە بوو، بۆئەوەی ڕێزێکی زیاتری پێ ببەخشم بەردەوام بووم:

"هاوڕێیان لەڕاستیدا ئێوە بەهەڵە لە محەمەد تێگەیشتن، محەمەدیش لە پەرۆشیدا خۆی خستە هەڵەوە، ئەگەر مۆڵەتتان پێ بدایە قسەی بکردایە، بڕوام وایە کە شتی جوانتری دەوت. لەناکاو کەش و هەوا ناخۆش بوو، ئەویش بێ ئەوەی بیربکاتەوە کەوتە ناو ئەو کەش و هەوا ناخۆشەوە و بەبێ ویستی خۆی هەندێك شتی وت".

لەڕاستیشدا ئەو هاوڕێیانەی کە ڕووبەڕووی بوونەوە لەسەر حەق بوون ئەوانیش ئاماژەیان بۆ هەندێك ڕاستی کرد.

"بڕوام وایە ئەو هەڵەیەی کە لەم نێوەندەدا هەیە شێوازی مشتومڕ و نزیکبوونەوەمانە لە یەکتری، بەڵام بڕوام وایە کە لەم پۆلەدا قسە و گفتوگۆی درووست دەکرێت و ئەنجامی باشی لێدەبێتەوە. فشاری پۆلەکە یەکسەر هاتە خوارەوە، چ محەمەد و چ ئەو قوتابییانەی کە ڕووبەڕووی بووبوونەوە دڵخۆش بوون، هەمووکەس ئەو پەیامەی کە پێویستە وەری بگرێت، وەریگرت.

ئەم وانەی یەکەمە کە بەتوندی دەستی پێکرد و بە خۆشیی کۆتایی پێهات، هەواڵدەرێکی گرنگی گەشەسەندن لەکاکڵەیدا بوو.

دوابەدوای دەمەقاڵێی وانەی یەکەم دەستم کرد بە بیرکردنەوە، ئەگەر لە محەمەددا بەها مرۆییەکان، وەکو هەستی وەفاداری و ڕێزی ڕادەربڕین هەبێت بەدڵنیاییەوە دێتە لام یان بەلایەنی کەمەوە زیاتر حەزدەکات کە لەنزیکەوە یەکتر بناسین و یاخود سوپاسێك یان ستایشێك دەکات. بەڵام وەك چۆن کە یاساکان بەبێ مانا لەقەڵەم دەدات، ئەگەر ڕێزی مرۆڤایەتیش ئاوەها بەبێ مانا بزانێت، بەدڵنیاییەوە چاوەڕێی شتی وەهای لێ ناکرێت. بۆناسینی بونیادی دەروونی و جەستەیی محەمەد دوزجەیی ئەم بابەتەم لەمێشکدا وەك پێوەرێك زیندوو کردبووەوە.

## بۆچی منت پاراست؟!

لەکاتی پشوودا چوومە ژوورەکەمەوە، یەکسەر بەدوامدا محەمەدیش هات، سەرەڕای ئەوەی نەمدەزانی بە چ نیازێك هاتووە، بەم هەڵسوکەوتەیدا لە محەمەد تێگەیشتم کە بەپێچەوانەی ڕووخسارییەوە خاوەنی چەند تایبەتمەندییەکی گرنگە. ئەم حاڵەتە لەناخمدا سۆزێکی وەهای بەرامبەر بەمحەمەد دروست کرد کە خۆشم تێنەدەگەیشتم. تۆزێك بەشەرم و کەمێك شەرمەزارییەوە وتی:

"مامۆستا ئەگەر دەگونجێت، دەتوانین کەمێك قسەبکەین؟"

هەسـتامەوە دەسـتیم گوشـیو بـەدەم پیشـاندانی شـوێنی دانیشتنییەوە:

– بێگومان قسە دەکەین، فەرموو یەکسـەر دوای ئـەوە داوای چـایم کـردو ویسـتم کەشـێکی گـەرم و گـوڕ دروسـت بکـەم، بەهەسـتانەوەو پێشـوازی لێکردنـی و بـانگکردنی چـا، لەلایەکـەوە محەمـەدی زۆر شەرمەزار کرد و لەلایەکی تریشەوە زۆر دڵخۆشی کرد.

"مامۆستا داوای لێبوردن دەکەم لەو هەڵسوکەوتە ناشـیرینانەی کـە لەپۆلدا نواندم". بەوتنی ئەمە دەستی بەقسە کرد: "بـەلام وانەیـەکی هێندە ناسکتان وتەوە کە بەڕاستی منی زۆر شەرمەزار کرد"

لەوەلامدا وتم: "نەخێر محەمەد دلگران مەبـە" ئەوسا چـوومە نـاو باسەکەوەو وتم:

"ئێمـە بەمانـە ڕاهـاتووین ، ئـەوەش بزانـە کـە هـەرگیز لـەتۆ زویـر نەبووم".

محەمەد هاتە سەر باس کردنی بابەتە سەرەکییەکەی ناو ناخی:

ـ "مامۆسـتا بۆچـی هەسـتت بەپێویسـتی پارێزگـاری کـردن لـە مـن کرد؟ بۆ ئەوەبوو کە من شەرمەزار بکەیت و جارێکی تر قسـە نەکـەم؟ یاخود ویستت من ڕابکێشیت بۆ لای خۆت و باسی هەندێك ڕاستیت بـۆ بکەم؟"

لاوێکـی زۆر وریـا و زیـرەك بـوو، خـۆی لەخۆیـدا بـوێری درکانـدنی ڕاکانی بەو شێوازە سەیرە ئەمەی دەسـەلماند، سـەرەڕای ئـەوەی کـە دیاریکردنی بابەتەکە نیشاندەری ئەوە بوو.

منیش بەپێکەنینەوە وەڵامم دایەوە: "نیازی سەرەکی من بێجگە لە پاراستنی تۆ و شەرمەزارکردن و ڕاکێشانی تۆ بـۆلای خـۆم، جێبـەجێ کردنـی هەنـدێك یاسـاش بـوو لەپۆلـدا. لـەو جـۆرە حاڵەتانـەدا لەگـەڵ هەرکامێك لە قوتابییانم هەمان ڕەفتارم نواندووە". سەری نـەوی کـرد و بەهێواشی لەقاندییەوە، منیش بەردەوام بووم لەسەر قسەکانم:

"ئەوەی کە من زۆر گرنگـی پـێ دەدەم و گـرنگترین یاسـایە لـەلام، ئەوەیە: هەموو کەسێك بتوانێت بەئاسوودەیی قسە بکـات و بەرامبـەر قسەکەریش ڕێز پیشان بدرێت. بەدەنگێکی پەرتەوازەوە وتـی:

" مامۆستا بۆچی ئەوەندە دیموکراتیت ؟ من ئەم هەڵسوکەوتەتم نە لە مامۆستایەکی ئایینی و نە لە مامۆسـتایەکی نوێخـواز نـەدیوە. ئایـا ئەمە هۆیەکی تایبەتی هەیە؟ محەمەد دوزجەییش دەیویست بەشان و باڵمدا هەڵبدات، لەم دوواندنەیەوە ئەوە دەردەکەوت. وتم:

– نەخێر، پـێم وایـە کـە ژمارەیـەکی زۆری مامۆسـتایان بـە هـەمان شێوە بیر دەکەنەوە و هەمان شت دەکەن، فەلسەفەی بنـەڕەتیی مـن لەم بابەتەدا ئەوەیە کە هەرچۆنێك بێت دەبێـت بۆچوونە جیاوازەکـان گوێیان لێبگیرێت گەرچی زۆرجیـاوازیش بـن، بێـدەنگکردن ڕێگەچـارە نییە. کەسی قسەکەر کاتێك تێدەگات بیرو بۆچـوونەکانی هەڵـەن ئـیتر

بێدەنگ دەبێت. خۆ ئەگەر بەزۆر بێدەنگ بکرێت ئەوا بەناپاساپی دەست دەکات بە قسەکردن و لەزۆر ڕووەوە کێشە بەرپا دەبێت.

"زیان لە کەسی قسەکەرەوە نایەت، زیانی سەرەکی لەو کەسانەوە پەیدا دەبێت کە قسەیان پێ ناکرێت. بواری دەربڕینی ڕاوبۆچوونی جیاواز جوانییە، نوێگەرێتییە، تەبایی نێوان کەسەکان لەئەنجامی گفتوگۆوە دێتە مەیدان، ئەگەر بەناوی گونجاندن و پێکهاتنەوە مرۆڤەکان بێدەنگ بکرێن، ئەوا دەبێتە هۆی دروست بوونی بەرەنگارییەکی نهێنی و سەخت، ئەمەش زیان بەئاسودەیی کۆمەڵگا دەگەیەنێت. لەبەرئەمە دەست خۆشیت لێدەکەم بۆ ئەو گوزارشتە ڕاشکاو و لە ناخەوە ڕێچکە بەستووەی کە لەپۆلدا نیشانتدا. ئەو بارەی کە من پێی ئاشنا نەبووبووم شێوازتان بوو، بەردەوامبە لەسەر دەربڕینی ڕاوبۆچوونەکانت و تێگەیشتن لە بەرامبەرەکانت. دڵنیاشبە کە کۆمەك و پشتیوانیی تەواوت لە منەوە پێدەگات. محەمەد دوزجەیی زۆر بەئاسودەییەوە وتی: " مامۆستا بە بیستنی ئەمانە زۆر دڵخۆش بووم، ڕەنگە بڕواش نەکەیت بەڵام ئەمە یەکەمجارمە مامۆستایەك بناسم ئەوەندە لێم نزیك بێتەوە و لەئاست بیرو بۆچوون و هەڵسوکەوتەکانمدا مامەڵەیەکی دروست و تێگەیشتنێکی تەندروستی هەبێت، چی بکەم ناتوانم قسەکانم بشارمەوە بەم جۆرە قبووڵم بکەن، لە هەموو جێگەیەکدا دەیڵێم ناتوانم خۆم بگرم، قسەم لەڕووە لەدەربڕینی ئەو ڕاستیانەی کە باوەڕم پێیانە ناتوانم دان بەخۆمدا

بگـرم، یەکبینـە باسـکردنی هەمووشـتێك بووەتـە مـاڵ بەسـەرمەوە، ڕاشـکاویم خۆنواندنمـە، بـەڵام گوێیـان پێنـادەم، مـن ئەگـەر ئـەو ڕاستییانەی کە دەیانزانم، نەیاندرکێنم یـان لەگەڵیانـدا نـەژیم، نـاتوانم دڵخۆش ببم. ئـەم وتانـە، نیـەتێکی پێشـین، بـۆنی نیـازی هەڵبـژاردنی بەئەنقەستی ژیانێکی زیانبەخشیان لێ نایـەت، یـان واتـای سـووربوون لەسەر بۆچوونێکی هەڵە ناگەیـەنن. بـەڵکو ئامـاژەی بـەردەوامبوون و پێداگریی لەسەر ڕێگایەك لێدەخوێنرایەوە کە خۆی بەڕاستی دەزانی و دەیویست بەڕاشکاوی و مەردانە پیایدا گوزەر بکات.

## فەلسەفەی بێ یاسایی گەنجێتی

بۆ زیاتر نیگەران نـەکردنی محەمـەد بابەتەکـەم گـۆڕی، دەمویسـت ئەم گەنجـە زرنـگ وقسـە لـەڕوو و نەترسـە، کـەمێك زیـاتر لەنزیکـەوە بناسم.

"کەمێك باسی خۆی و خێزانەکەی کرد، برایەك و خوشکێکی هەیـە، وتـی: کـە ئاسـتی بـژێوییماڵیـان باشـە... بـۆ زیـاتر ڕوونکردنـەوەی بابەتەکە وتم:

محەمەد، وا دەردەکەوێت کە کێشەی خێزانی و مادیتان نییە. ئـەی ئەم فەلسەفەی بێیاساییە لەکوێوە پەیدا بـووە؟ وەك ئـەوەی بچێتە ناو بابەتێکی گرنگ و بەماناوە، خۆی کۆکردەوەو وتی:

"مامۆسـتا کتێبـی زۆر دەخوێنمـەوە، زۆر دەگـەڕێم و زۆرحـەزم ل ەدروستکردنی پەیوەندییە لەگـەڵ خەڵکیـدا بەتایبـەتیش ئەوشـتانەی

که جیاوازو نامۆن سەرنجم زۆر ڕادەکێشن. ژیانێکی نەخشە بۆ داڕێژراو بەیاسا و جێگیر و یەك شێوازیی خواستی من نییە، پێویستە خۆم یاسای ژیانی خۆم دابڕێژم.

هەر یاسایەکیش ببێتە ڕێگرم لای دەبەم. هەرشتێك ببێتە بەربەست لەبەردەم زەوق و خولیا و بۆچوونەکانمدا بەلای منەوە شتێکی خراپە. دەمەوێت بەئارەزووی خۆم بگەڕێم و بەئارەزووی خۆم جل و بەرگ لەبەربکەم و بەپێی ویستی خۆم بژیم".

دەمویست پرسیاری بابەتێکی لێبکەم بەلاّم بۆ ئەوەی دلّی نەشکێنم لێم نەپرسی، وەك بلّێیت ناخی خوێندبمەوە خۆی بابەتەکەی کردەوە.

"مامۆستا، دوای ئەم شتانەی کە باسمکردن پێدەچێت بەمێشکتاندا هاتبێت و حەزتان کردبێت ئیمان و باوەڕ و ڕوانینی من بۆ ڕەهەندەکان بزانن."

بەپێکەنینەوە وتم:

- "بەلّێ"

وتی:

- "ئێستا دەمەوێت بەشێوەیەکی زۆر ڕوون بۆتانی باس بکەم: لە قۆناغی سەرەتایی و ناوەندیدا، بەرامبەر بە دین و ئەوشتانەی کە لەو بازنەیەدان پەیوەندییەکی باشم هەبوو، بەلاّم دوای خوێندنەوەی

ئەوکتێبانەی کە ماموستاکانم یان هاوڕێکانم بۆیان پەسەند دەکردم، سەرنجەکانم بەرەو دونیایەکی تر چوون".

پرسیارم لێکرد: "وەکو چی؟"

وتی: "پەیوەندییەکی پتەوم پەیداکرد لەگەڵ هەردوو بیرۆکەی ماددەگەری و داروینیزم، لەم بوارەدا هەوڵی زۆرمدا".

وتم: "باشە، ئەی ئەو خاڵەی کە پێیگەیشتیت کوێ بوو؟"

بەهەڵسوکەوتێکی لارو وێری کەساسەوە وتی: "وای دەبینم کە زانیاری و بۆچوونەکان دەربارەی دین و خواوەند زۆر لە پاشەوەن و بەم سەردەمە ناخۆن. چەند گاڵتەئامێزە لەم چاخی چوونە نێو بۆشاییەکانی گەردوون و لەم سەردەمی پێشکەوتنەدا، مرۆڤ باوەڕی بەبیرۆکەگەلێك یان شێوە ژیانێك هەبێت کە چەندەها سەدە لەمەوبەر هاتوونەتە کایەوە. مرۆڤ دەتوانێت بڕوای بەهەرشتێك هەبێت کەدەیەوێت، بەڕاستی ڕێزێکی گەورەم هەیە بەرامبەر بەوان، لەبەرئەوەی دایکم و باوکیشم نوێژ دەکەن. بەڵام من بڕوام بەشتانێکی وەها نییە. تاکە ڕێگەیەك کە بەمن بخوات شێوە ژیانێکی بێ یاساو کراوە و بێ ڕێگرە، بەپێی ویستی خۆم و بەئازادی، ئەگەر پێویستیش بکات خۆم یاساکان دروست دەکەم...

پرسیارم کرد و وتم:

"ئەی باشە ئەمە گونجاوە؟" وتی" گونجاویش نەبێت بەلایەنی کەمەوە حەزم لێیە کە وابێت."

پێم وت: "ئایا دوورەپەرێزیت لە دین و لە خوا، ئەوەیە کە هەندێك ڕێساو پرەنسیپی تیادایە کە دەبنە ڕێگری ژیانت؟"

وتی: "بەڵێ، لەبەرئەوەی دینەکان بەتەواوی دەبنە کۆسپ لەبەردەم بەدەستهێنانی ئارەزوو و خواستی مرۆڤەکان. بۆئەوەی مرۆڤ جۆرە ژیانێك کەخۆی ویستی لێیەتی و ئارەزوو و کەیفی تەواوی پێدەبەخشێت بژی، پێویستە لە دین و کۆتەکانی دین ڕزگاری ببێت. تەنانەت پێویستە هیچ بیر لەم بابەتە نەکەیتەوە"، بۆئەوەی زیاترکەش و هەوای گفتوگۆ گەرم بکەم، پێشوازی گەرمم لێکرد و داوای چاییم کرد بۆ هەردووکمان و پێم وت: یانی بیرکردنەوەش لەم بابەتانە نارەحەتت دەکات؟

وتی: زۆریش.

وتم: باشە پێت وایە چۆن ڕزگارت دەبێت لەو بیرۆکانەی کە ئاسودەییتیان زڕاندووە؟

- بەبیرنەکردنەوە لەم بابەتە، لەبەرئەوەی لەو ژیانەی کە تێیدا دەژیم، تاکە یاسایەك هەبێت ئاسوودەییم لەناودەبات دەبێتە بەربەستی خۆشگوزەرانییم.

- یانی دەتەوێت ئاوەزت بێدەنگ بکەیت، وایە؟

- بەڵێ

- بەوتنی بێدەنگبە، عەقڵت بێدەنگ دەبێت؟ بۆئەوەی وەڵامم نەداتەوە، ویستی بابەتەکە بگۆڕێت بەڵام من خستمەوە سەر بابەتەکە و پرسیارەکانم درێژە پێدا:

"باشە، مادەم وەها بیردەکەیتەوە بۆچی ناوەندێکی وەك زانکۆت هەڵبژارد کە کار بەیاسا دەکات و، پێویستی بە بەرپرسیارێتی زیادە و بەهەوڵدانی هەمیشەییە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە زۆری لە خۆی کرد و وتی:

- لەبەرئەوەی باوکم پێی وتم، بەهەرجۆرێك بێت ئەگەر لە زانکۆیەك نەخوێنم ئەوا حاشای ئەوەم لێدەکات کە کوڕیبم، خەرجیشم لێدەبڕێت، بۆیە منیش ناچاربووم.

به پێکەنینەوە وتم:

- یانی، بەدەر لەخوێندن نیازت پارە کێشانەوەیە لە باوکت، وایە؟

ئەویش بەپێکەنینەوە:

- دەکرێت ئاوهاش بێت، ڕەنگە لەبەر بێزاربوون لە پرسیارەکان یاخود بەهۆی باسکردنی ئەو بابەتانەی کە وەڵامدانەوەیان سەخت و دژوار بوو، لەناکاو هەستایە سەرپێ و وتی:

"مامۆستا من دەبێت بچمە دەرەوە" دەستی درێژ کردو وتی:

"زۆر پێخۆشحاڵ بووم زوو زوو سەردانی ئێوە دەکەم. بوونی ئێوە لەم شوێنە بێزارکەرەدا بۆ من ڕووناکییەکی ئومێد بەخشە" چووە دەرەوە.

لەقسەکانیدا دووڕوویی بەدی نەدەکرا چی لەناخیدا هەبوو دەیگوت، لەبەرئەوە گەنجێکی باوەڕ پێکراوی دڵسۆز بوو.

ئەم گەنجە هەڵەشەو زیرەك و لێهاتووە مەردو جەربەزەیە، لەچنگی ژیانێکی بێسەروبەر و بێبڕواییدایە، بێبەزەیی و بەبێ ئەوەی هەست بەوەبکات بەرەو کوێ دەڕوات و بەسووربوون و بەردەوام بوونی لەسەر ئەو ڕێگەیە منی زۆر ئازاردا. منداڵێکی دوور لە باوەڕ لەخێزانێکی دینداردا، لە سیستەمێکی بەدخوو و ناڕێك و تاریکدا چاوەڕێی چ جۆرێکی تری لێدەکرێت؟

بەڕاستی زۆر نیگەران بووم، دەبوایە محەمەد دوزجەیی و چەندەها گەنجی تری وەکو ئەوم ڕزگار بکردایە. ئەو کەسانەی کە لەناو ژیانێکی ئاوەها بێماناو بێ بەرپرسیارێتیدا گەورەبوون، دەبنە بەلا بەسەر دەوڵەت و کۆمەڵگا و هەم خێزانەکانیشیانەوە، لەبەرئەمە دەبوایە پەندی زۆر وەربگیرایە لەتەقەی تفەنگەکان و لە سووتانی نیشتمانەکان و گریانی دایکەکان. وەك پەیوەندییەك بەبابەتەکەوە لە بەرهەمێکی بەدیعوززەمان سەعیدی نورسی کە بەناوی دادگاییەکانەوەیە(المحاکمات) ئەم پەیڤانەم بیرکەوتەوە:

(هەموو مرۆڤێك لەسەر سروشتی پاك لەدایك دەبێت. کاتێك کە بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێت هەندێکجار ڕێی لەهەڵە دەکەوێت، وا گومان دەبات کە ڕاستییەو حەققی دیتووەتەوە بۆیە لەئامێزیدا دەیپارێزێت. لەبەرئەوە بەئاگاهێنانەوەی ئەو کەسانەی کە خۆیان فەلسەفەی ژیانی

خۆیـان لەسـەر بنەمایـەکی چـەوتی بەڕاسـت زانـراو دادەڕێـژن و، هاوکـاریی کردنـی بەئاگاهێنـەرەوەکان ئـەرکێکی زۆر گرنگـە بـۆ ئاسوودەیی کۆمەڵگا).

منـیش بـۆ بەشـداریکردن لەبـەجێهێنانی ئـەم ئەرکـە گرنگـەدا بـە نزاکردنەوە لەژوورەکەم هاتمە دەرەوە.

## وانەی دووەم

هەفتـەی دووەمـە، کـە چـوومە هـەمان پۆلـەوە چـاوەکانم یەکبینـە لـەدوای محەمـەددا دەگـەڕان، داخـۆ یەکـەم بەیەکگەیشـتنمان، کاریگەرییەکی باشی لەسەری دروسـتکردووە یـان خـراپ؟ زۆر مـەراقم بوو. دووبارە لە ڕیزی ناوەڕاسـتدا بەقـژە درێژەکەیـەوە و بـە مـۆدێلی جل و بەرگە سەیر و دیارەکانییەوە خۆی دەنواند.

نزیکبوونەوەو تێکەڵبوونی خێرای لەگەڵ هاوڕێیانی لە دەووروپشتیدا ئاشـکرابوو، سـەرگەرمی گفتوگۆیـەکی گـرنگ و گـەرم بـوو. گرنگـی پێدەدان، قسەی دەکرد و گوێی بـۆ ڕادەگـرتن. بەهـەرحاڵ گـەنجێکی چالاك و خـوێن گـەرم بـوو، وادەردەکـەوت کـە هەنـدێك لـەو لاڕێیـی و ڕەقییەی کە لەهەڵسوکەوتەکانیدا هەیبوو لەوانەی یەکەمدا، نەیمابێت. لـەو ئامـاژانـەی کـە لەهەڵسـوکەوتەکانیدا دەردەکـەوتن بەدیـدو بۆچـوونەکانی خـۆی، دروسـتکردنی بنکـە و دۆزینـەوەی هاوسـۆزو کەسـانی نزیـك بـوو لـە خـۆی، یـان بـەدەربڕینێکی تـر لـە تەقـەلای

فراوانکردنــی دەورووبــەری خــۆی و دروســتکردنی گروپێکــی دەدا کــە ئەمەش بەئاشکرا دیاربوو.

بابەتی وانەکە مرۆڤ بوو، باسی بچووکترین تــاکی کۆمەڵگــەم دەکــرد کــە مرۆڤــە. لــەکاتی باســکردنی مرۆڤــدا بیروبۆچــوونی قوتابیەکانیشــم وەردەگــرم، بــەم شــێوەیەش بۆچــوونی گشــتیی پۆلەکەشــم چــنگ دەکەوت. سڵاوم لــە قوتابییــەکان کــرد، حــاڵ و هــەواڵیانم پرســی، بــۆ ئامادەکردنی پۆل بۆ وانەکە لیستی ئامادەبوونم هێنا، ســەبارەت بــەم بابەتە هەندێك وتووێژی کورت ئەنجامدرا.

بەپرسیارێك دەربارەی گرنگی بابەتەکە (مرۆڤ چییە؟)، دەســتمکرد بەوانەکــەم. مەبەســتم لێــرەدا لەلایەکــەوە بــۆ ســەرنج ڕاکێشــانی خوێنــدکاران بــەلای وانەکــەداو، لەلایــەکی تــرەوە دەرخســتنی بیروبۆچوونی قوتابییەکان سەبارەت بەبابەتەکە بوو.

قوتابییەکان یەکەمجار بەرامبــەر ئــەم پرســە بێــدەنگ بــوون دواتــر دەستیانکرد بەدەربڕینی بیروبۆچوونەکانیان.

وتەی زۆرینەی قوتابییەکان دەربارەی پێویستی بوونی پەیوەنــدی لــەنێوان مــرۆڤ و خــواو ڕێکخــەری ئــەو پەیوەندییــەش کــە (ئایینــە) و مەبەستداریی لە هێنانە دونیای مــرۆڤیش (کــە کــامڵترین بــەدیهێنراوە) بێگومانی لە زیندوو کردنەوەی پاش مردن و لێپرسینەوە و پاداشــت، وتەو دیدی زۆینەی خوێندکاران بوو.

لەم بوارەدا بەشێکی زۆری قوتابیانی پۆلەکە، لەو گەنجانەبوون کە بیروبۆچوونی دین و زانستیان پەسەند دەکردو باوەڕیان هەبوو.

هەروەك ئەوەی چاوەڕێم دەکرد محەمەد دوزجەییش قسەی کرد. بەشێوازە تایبەتەکەی خۆی بەپەرۆشیو بەئاشکرایی و ئاوازێکی گڕەوە: (من لەم بابەتەدا جیاواز لە هاوڕێکانم بیردەکەمەوە)، بەم وتەیە دەستیپێکرد دووبارە لەشێوازیدا بەجۆرێکی هەستپێکراو زبری و لوت بەرزیی تێدا بەدیدەکرا.

وتی: با پێشەکی ئەوە ڕابگەیەنم کە من باوەڕم بە پاداشت و لێپرسینەوە نییە، مرۆڤ زیندەوەرێکە کە لەئەنجامی گەشەسەندنێکی قۆناغ بەندییەوە گەیشتووەتە ئەم دۆخەی ئێستای، بۆ هاتنە ئەم بارەشی پێویستی بەهیچ جۆرە ڕێپیشاندەرێك نییە، میکانیزمی خود نوێکارییە. مرۆڤ بۆئەوەی بتوانێت بەپێوە ڕابوەستێت و بتوانێت خۆی بپارێزێت هەندێك یاسای ڕێکخستووە، بەپێکهاتنی بەها هاوبەشەکان لەژیانی کۆمەڵگادا ئەم بارەی ئەمرۆی هێناوەتە بوون.

مرۆڤ لەبەرامبەر هاتنەبوونی و بەڕێوەبردنی کاروباری ژیانیدا، قەرزاری هیچ کەسێك نییە، لەباشترین تەرزی ژیان دەژی و دەڕوات، بۆ ئەو مرۆڤەش لەوێدا هەموو شتێك کۆتایی دێت، مرۆڤ بۆئەوەی ئاسوودەبێت، پێویستە تەنها بیر لەژیانی خۆی بکاتەوە، نەبێتە دیلی هیچ یاسا و ڕێسایەك، محەمەد بە بەرەڤانیکردن لە بۆچوونەکانی دەیویست ئەوە بخاتەڕوو کە بەدیهێنانی مرۆڤ پێویستی

بەبەدیهێنـەرێك نییـە و، منـەتباری هـیچ زاتێکـیش نییـە، بـەم جـۆرە دەیویسـت خـۆی لەئـەرك و بەرپرسـیارێتی و بەندایـەتی بدزێتـەوەو هەڵبێت... لەبنەڕەتدا، ئەو ڕێبازە فکرییانەی کە هـزری محەمـەدیان جەنجاڵ کردبوو، بیرۆکەکانی ماددەگـەری و مارکسـیزم و داروینیـزم و ڕوانینـە بێباوەڕییـەکان بـوون. کاریگـەریی محەمـەد بـەو ڕێبازانـە و موتالاکردنی پەڕاوەکانیشیان بەڕوونی دیاربوو.

ئەو بیرو بۆچوونانەی کە محەمەد خستنیەڕوو، سەرەڕای ئەوەی کە کاردانەوەی توندو تیژی قوتابییانی پۆلەکەی وروژاند، بـەڵام یەکسـەر چـوومە نـاو باسـەکەوەو وتم: ئەگـەر هەرکەسـێك بـیرو بۆچـوونێکی دروستی هەیە با قسـە بکـات، لـەدەرەوەی ئەمـەش ڕێگـای تـر تـاقی مەکەنـەوە. ئـەنجا لـەپاش تـاوتوێکردنی بیروبۆچـوونە جیاوازەکـانی پەیوەندیدار بەمرۆڤەوە، گەڕامەوە بۆ سەر وانەکەم.

## مرۆڤ چییە؟

قسـەکانم، بەچـەند وتەیـەکی (ئەلیکسـیس کـارڵ) دەربـارەی مـرۆڤ دەستپێکرد کە دەڵێت:

(مرۆڤ پێویستە لەسەرەتادا خۆی بناسێت و خۆی وەکو هاووێنـەی پـەراوێك بخوێنێتـەوە، ئـەو کەسـەی خـۆی نەخوێنێتـەوە ئەگەرچـی بچوکترین نهێنی گەردوونیش بزانێت هەر بەنەزان دەمێنێتەوە)

لەوساتەدا قوتابییەکم بەشداری کرد و وتی:

" مامۆستا، بۆ دۆزینەوەی پەیڤی جوان دەربارەی مرۆڤ، چوون بـۆ ڕۆژئـاوا پێویسـت ناکـات، ئـەو زانـا بـەڕێزو کەسـایەتییە زانسـتییە مەزنانەی کە لەنێو خۆماندا لەدایك بوون و پێگەیشتوون زۆر لەم وتانە نایابترو سەنگینتریان وتووە.

ئەوەتا بۆ نموونە؛ بەدیعوززەمان (سەعیدی نورسـی) وتەیـەکی زۆر جوانی هەیە کە بەم شێوەیە دەسـت پێـدەکات و دەڵێـت: (ئـەی ئـەو مرۆڤەی کە خۆت بەمرۆڤ دەزانیت خۆت بخوێنـەرەوە.....)" زۆر لەمـە زیـاتریش گونجـاوە کـە بخرێتـە سـەری، وتـەکانیم پەسـەند کـردوو، بـەردەوام بـووم لەسـەر قسـەکردن و وتم: "هاوڕێیـان، هـیچ کـات پرسیارتان لەخۆتان کردووە بڵێن: من کێم؟ چیم؟ لە کوێوە هـاتووم؟ بۆچی هاتووم؟ ئامانجم چییە و بۆ کوێ دەڕۆم؟ قەرزاری کێم؟ وەکـو چی و چۆن لێپرسینەوەم لێدەکرێت؟"

ئەگەر ئەمانەو هاوشێوەی ئەم پرسیارانە بپرسن، بەدڵنیاییەوە تامەزرۆی وەڵامەکانیشی دەبن؟ ئەگەر کەسێکیش خولیای وەڵامەکەی بووە، ئایا هیچ بەدوادا گەڕانێکی بۆکردووە؟ بێدەنگییەکی قووڵ باڵی بەسەر پۆلەکەدا کێشابوو، هەموو سەرنجیان دەدا، منیش ئەم بارودۆخەم بەهەلزانی و قسەکانم درێژەپێداو پرسیارەکەمم کەمێك گشتگیرتر کرد تاکو لەسەر بناغەیەکی زانستیی درێژەی پێبدەین. ئەو کەسەی کە بۆسەرکەوتن دەکەوێتەڕێ و دەیەوێت ژیانی لێوان لێو بکات لە سەرکەوتن، ئایا لە مەسەلەی خودناسییدا چەندە سەرکەوتووبووە؟

ئەو کەسەی کە گرنگی بەبچوکترین وردەکارییەکانی گەردوون و دەورووبەری دەدات، ئایا چەندە گرنگی بەنهێنی و وردەکارییەکانی خۆی دەدات؟ ئادەمیزاد تەمەنێك لە کەشفکردنی ئاسمانەکان و چوونە نێو قوڵایی دەریاکان سەرف دەکات، ئەی ئەبێت چەندە لەپێناو خود شوناسی و دۆزینەوەی گەنجینە پەنهانەکانی نێو جیهانە پەنامەکییەکانی دەروونیدا و، دابەزینە نێو قووڵاییە بێبنەکانی خۆیەوە خەرج بکات. بەدەربڕینێکی تر (ئەی ئەوکەسەی کە هەڵپە دەکەیت بۆ بەدەستهێنانی کاری گرنگ و، ڕادەکەیت بەدوای ئامانجی گەورەداو، عەودالّی دۆزینەوەی زۆرێك لەنهێنییەکانیت، ئایا خۆت چەندە دەناسیت و، چەندە پەی دەبەیت بەهەڵگرتنی بەها و ڕاسپاردە نهێنییەکان؟ لەوانەیە لەڕۆژێکدا بەدەیان جار پرسیارت

کردبێت و مەراقت کردبێت سەبارەت بەنهێنییەکانی بوونەوەر و دونیا، ئەمانە چین؟ چۆن دروستبوون؟ سوودیان چیە؟ دروستکەریان کێیە؟ ئەی ئایا چەند ئاڕاستەیانت کردووەتە خۆت و لە خۆتت پرسیوە، من کێم؟ لە کوێوە هاتووم؟ بۆکوێ دەچم؟ ئامانجم چییە؟ کێ منی ناردووە؟... محەمەد پاش مۆڵەت وەرگرتن بەشداری لەقسەکاندا کردو وتی:"مامۆستا، تا ئەم ئەندازەیەش وردبوونەوەو تاڵکردنی ژیان چ مانایەکی هەیە؟"

بەزەردەخەنەیەکەوە بەردەوام بووم:

ئایا شتێکی لەوە سروشتیی تر هەیە کە مروڤ لەسەرەتاوە خۆی بناسێت و خۆی بە بەرپرسیار دابنێت و بەدوای ئەو شتە نەزانراوانەوە بێت کە پەیوەندییان بەخۆیەوە هەیە؟ ئەمە سەرەتاییترین مەرجی مروڤ بوونە. بەگەڕانەوە بۆ سەر بابەتەکە قسەکانم درێژەپێدا:

ماهییەتی مرۆڤ و نهێنی ئەرکەکانی، هەمیشەو بەبەردەوامی ئەو مێشکانەی سەرقاڵکردووە کە بیردەکەنەوە لەو جۆرە پرسیارانەی کە زۆرێك لەو کەسانەی کە ویستویانە تەنها بەپێوانەی ئاوەزی خۆیان ئەم نهێنی و نەزانراوانە شیبکەنەوە لەسەلماندنێکی هەڵەو بێجێدا خۆیان دۆزیوەتەوە. هەندێك لەمانە وایان داناوە کە مرۆڤ بریتییە لە (بوونەوەرێکی ئابووری و بارستەیەکی ماددی). هەندێکی تریشیان وتویانە مرۆڤ ئاژەڵێکی ئاوەزدارە. لەکاتێکدا هەندێك لە زانایان مرۆڤ بە بوونەوەرێك لە سەروو بەدیهێنراوان پەسەند دەکەن کە شایستەی

پەرستن و بەندەگی بۆکردنە، هەندێکی تریان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە مرۆڤ (شتێکی هیچ)ە، لە نێوان ئەمانەشدا هەندێك هەن کە جێگەی خۆیانیـــان کردووەتـــەوەو بڕیاریـــان داوە کـــە مـــرۆڤ (بوونـــەوەرێکی نەناسراوە) .

## ئایا مرۆڤ دەتوانێت بەعەقڵی ڕاستیی بدۆزێتەوە؟

محەمەد دەمێك بوو لەهەلێکی وەها دەگەڕا، لەپڕ هەستایە سـەرپێ و بەشێوەیەکی توندڕەوانە پرسیاری کرد: "مامۆستا مـرۆڤ بـەپێوەرە عەقڵییـــەکانی ڕاســـتییەکان دەدۆزێتـــەوە، جـــا کەواتـــە چ پێویســـت بەفـــەرمان وەرگـــرتن دەکـــات لـــەهێزێکی تـــرەوە بـــۆ ئاڕاســـتەکردنی و هەنگاونانی ! ".

وتم: سوپاسـت دەکـەم. پێویسـت بـوو ئـەم پرسـیارەت بکردایـە. پرسیارکردنەکەشی زۆر باش بـوو، چـونکە بیروبۆچـوون و فەلسـەفەی لەم جۆرە هەیە، بەم هۆیەوە بابەتەکەش فراوانتر دەکەین.

هەروەك دەزانـن کـە مـرۆڤ هەمیشـە عـەودالّی ڕاسـتیی و جـوانیی و حەقیقەتە، بەدوی زانینی گەردوون، مانـای مـرۆڤ بـوون و ئەرکـەکانی مرۆڤدایە.

مرۆڤ بەهۆی عەقڵیەوە هەوڵی ڕوونـاك کردنـەوەی دونیـاو گـەردوون دەدات. ئەگـەر مـرۆڤ پاڵپشـتی عـەقڵ و هـزر بـە بـاوەڕی پتـەو و سیستەمە ڕەوشتییەکان نەکات ئەوا لەبانگەشەکەیدا (بەدوای ڕاستیدا

دەگەڕێم) دەکەوێتە هەڵەو نەپێکانی زێدەترەوە. ئەمە لەدونیای فەلسەفەدا زۆر نموونەی ڕووبەڕووی هەیە، هەندێك لەمانە یان بوون بەبێباوەڕێك کە نکوڵی لەهەموو شتێك دەکەن یان بوون بەماددە پەرست (ماتریالیستێك) کە لەماددەدا بۆ هەموو شتێك دەگەڕێن.

مرۆڤ دروستکراوێکی کۆمەڵایەتییەو پێویستی بەپێکەوە ژیان و هاوبەشیکردن و یارمەتیدان و پاڵپشتیکردنی یەکتری هەیە، ئەم هەستانەی ناو مرۆڤ پێویستیان بە بەهێزکردن هەیە، چونکە کۆمەڵگای ئاسوودە لە کەسانێك پێکهاتووە کە باش پەروەردەکرابن و پەیڕەوی یاساکانی کۆمەڵگابن.

مرۆڤ چەندە بەرامبەر کۆمەڵگاکەی، لەبیروڕا و، بنەماکانی خووڕەوشت و، شێوازی ژیانیدا تەباو بەسوودبێت، ئەوەندە هەم خۆی و هەم کۆمەڵگاکەشی دڵخۆش دەکات. بێگومان هەموو ئەمانەش بەوە دەبێت کە مرۆڤ خۆی بناسێت و بزانێت کە پاداشت و لێپرسینەوەیەك هەیە لەو شوێنەی کە لێیەوە هاتووەو ئەوەی کە بۆی دەچێت.

مرۆڤ لەکاتی لەدایك بوونەوە تا ساتەوەختەکانی مردنی، لە گەشەو هەڵکشانێکی جەستەیی، هزری و کۆمەڵایەتیدایە. مرۆڤ زیندەوەرێکە کە بارودۆخ و هەڵسوکەوتی جیاواز پیشان دەدات و ژیانی ماددیی و مەعنەویی و هەست و نەستی هەیە. مرۆڤ ئارازرو ئارەزوو و داواکارییەکانی بەجۆرێك فراوانن کە لەدونیادا جێیان نابێتەوە. چونکە مرۆڤ ناتوانێت لەکاتێکی تاك ڕەهەندا بژی، لەژیانێکی ڕابردوو بەرەو

داهـاتوودا دەژی. وابەسـتەگییەکی نەپسـاوی لەگـەڵ ڕابردوویـەکی لەدەستچـوو و داهاتوویـەکی نادیـاردا هەیـە. لەبـەر ئەمـە هەڵسوکەوتەکانی ئادەمیزاد ڕەنگدەرەوەی ڕابردووی و باری ئێستای ڕوانین و نەخشەکانی بۆ داهاتوو و ئاواتەکانیەتی. مـرۆڤ دەیـەوێت لـە بینراوەوە بۆ نەبینراو، لە وردەوە بۆ درشـت هـەموو شـتێك ببینێـت و بزانێت و بژیێت. ئەم مانایە زۆرکـات دونیـا بـۆ ئـەم بوونـەوەرە جگـە لەتەنگەبەرەیەك چی دی نییە، هەربۆیە مرۆڤ وەك گەردوونێکی بچووك و گەردوونیش وەك مرۆڤێکی گـەورە بینـراوە. ئەگـەر مـرۆڤ لـەدونیادا دەروونی پاك بکات و تواناو لێوەشاوەییەکانی بەوجۆرە بخاتەڕوو کـە مانای ژیان دەربخەن، ئەوا دەبێتە نموونەیەك کە سەرجەم مرۆڤـەکان بە سەرسامییەوە تەماشـای بکـەن. خـۆ ئەگـەر بێـت و بـەرەو خراپـە ئاراستە بکرێت ئەوا دادەبەزێتە دۆخێکـی وەهـا بـەدەوە کـە تەنانـەت دڕنـدەکانیش لەخراپـەی بترسـن. لەبەرئەمـە مـرۆڤ بـۆ ئـەوەی ببێتـە «مـرۆڤ» پێویسـتە هـەوڵی ئاراسـتەکردنی و چاکسـازیکردنی بـدرێت. ئەمەش تەنها بـەوە دەبێـت کـە مـرۆڤ لەگـەڵ بەرنامـەی دروسـتکەردا بەتەنها بەجێبهێڵدرێت.

ئـەو لێکۆڵینـەوەو بیروبۆچـوونە زانسـتیی و کۆمەڵایەتییانـەی کـە پەیوەنـدییان بـەخودی مرۆڤـەوە هەیـەو، بـاس لەکەسـێتی و دروسـتبوونی مـرۆڤ دەکـەن، ئـەوە پیشـان دەدەن کـە لـەناو هـەموو بوونەوەراندا بەرزترین پلەی هەیەو ژیرترین و کامڵترینیانە.

ئــەم مرۆڤـــەی کـــە لەوپـــەڕی سەرســـوڕهێنەری و ڕێکوپێکیـــدا دروستکراوە، پێویستە خۆی بناسێت. چونکە بوونـەوەرێکی بچووکی وەك مرۆڤ بەقەبارەی گەردوون پڕە لەنهێنی، مرۆڤ لەهـەوڵی ئەوەدایـە هەسارە گەڕۆکەکان کە ژمارەیان دەگاتە ملیۆنان و ئـەو ئەستێرانەی کە لەخۆر گەورەترن ئاشکرا بکات، کەچـی ئـەو خۆماندووکردنـەی بـۆ ناسینی خۆی، کۆنترۆڵکردن و دۆزینەوەی گونجاوترین بـاری ژیـان بـۆ خـۆی نـادات. مـرۆڤ کـە خـاوەنی پێکهاتەیـەکی مـاددی و مەعنـەوی دەرئاســایە، بەمەبەســتی ســوودگەیاندنی بــەخۆی و کۆمەڵگاکــەی پێویستە خۆی بناسێت و بزانێت کە ئامانج لەدروستکردنی چییە؟

ئەو مرۆڤـەی کـە هـەموو ژیـانی لـەپێناو کەشـفکردنی نهێنییـەکانی گـەردوون سـەرف دەکـات، پێویسـتە نهێنییـەکانی خـۆی و دونیـای ناوەوەی خۆی ڕوون بکاتەوە. پێویسـتە خـۆی بناسـێت و ئەرکەکـەی بزانێت، پێویستە لەبیری ئەو ڕێزو ئەمانەتانـەدا بێـت کـە کەوتوونەتـە ئەســتۆی، ئــەو مرۆڤــەی کــە دەرك بــەئامانجی بــەدیهێنانیو بوونــە هەڵگری بەها باڵاکـان ناکـات، هەسـت بـەهیچ شـتێکی تـریش ناکـات، لـەژیانێکی بـێ سـەروبەرو بـێ ئامـانج و بـێ مەبەسـتدا، نائاسـوودەو دڵتەنگ دەبێت و ئاسودەیی کەسانی تریش تێکدەدات. بنچینەییترین زانست کە پێویستە مرۆڤ بیزانێـت بریتییـە لـەزانینی خـۆی و ناسـینی دروســتکارەکەی و دڵنیــابوونی لــەزانینی هۆکــاری هاتنــە دونیــای و وەرگرتنی پاداشتی ئەو کردارانەی کە ئەنجامیان دەدات.

وەك دەركەوتووە، ئەو بیرۆكەو دیدانەی كە لەئاكامی شرۆڤەو هەڵسەنگاندنە تاكی و خواستە كەسییەكانەوە سەرچاوەیان گرتووە، لە خەملاندنی بەهای ڕاستەقینەی مرۆڤدا كەمتەرخەم بوون و گرفتاری نەنگی هاتوون. هۆكاری سەرەكی ئەم نابابەتی بوونە یان چەوت نرخاندنەیان دەگەڕێتەوە بۆ نرخاندنی ئادەمیزاد بە پێودانگە تاك ڕوانگەییەكان و دووری لە تیشك خستنە سەر لایەن و ڕەهەندە پێكهێنەرەكانی بونیانی ئەم كائینە.

هەڵبەت بۆ ناسین و گوزارشت كردنێكی دروست لە ئادەمیزاد ئاتاجی مامەڵەیەكی گشتگیرو هەمەكین لەتەك ئەو "بینراوە پەنهانە"دا .

پۆل لە ژێر ڕكیفی بێ دەنگییەكی تەواوەتیدا بوو. هەمووان تا ئەوپەڕی سنوور لە ژێر كاریگەری بابەتەكەدا بوون و تەنها بە سەرلەقاندن بەشدارییان دەكرد .

وابەستەیی ئەوان بە وانەكەوە شوێنكاری مەزنی بابەتەكەی تیایاندا نیشان ئەدا.

درێژەم بەوانەكە دا و وتم: بەڕێزان داخۆ ڕوانینی زانستەكان بۆ مرۆڤ چۆن بێت و ئەوان چلۆن دەربارەی بدوێن؟ با ئەم باسە پێكەوە گفتوگۆ بكەین . لە ڕوانگەی زانستەكانەوە مرۆڤ تەواوترین و كامڵترینی زیندەوەرانە. ئەم زیندەوەرە سەراپا لە نێو ڕێكسازییەكی ورد و كارسازییەكی سەرسوڕهێن دایە .

مـرۆڤ لـه تـەنها خانەیـەك دروسـت بـووە، ئـەو خانەیـەی کـە بـە "زایگۆت" ناودەبرێت و چاوی ئێمە بێ توانستە لە دیتنی مەگەر پاش سـەدەها جـار گـەورە کردنـی، لـە پـاش گەیشـتنی بـە قۆناغێـك کـە ملیۆنەها جار بەڵکو تریلیۆنەها جار لە قەبارەی خـۆی گـەورەترە، بـە چەندەها دەزگاو سیستەمی بێ وێنەو گونجاو بۆ ژیان ئارایش دەکرێت و وەك کارەکتـەرێکی کـارا پێشکەشـی شـانۆی ژیـان دەکرێـت و لەوێشەوە رۆڵی خۆی دەگێڕێت. زۆر جار مرۆڤ لـە ئاسـت دەرك کـردن بە نرخ و بەهای خۆی دۆش داماو دەمێنێتەوە، بە شـێوەیەك کـە ئـەو ملیۆنان خانەیەی کە مرۆڤ پەککەوتەیە لە ئاست دروست کردنی تـەنها دانەیەکیشیاندا چۆن ئاوا لە ژێر پەردەی گونجان و پێکەوە کارکردنـدا دەبنە مایەی ژیـان، بـوونی ئـەو خانەیـە (کۆرپەلـە) بـە جەسـتەیەکی تـەواو و گەیشـتنی هـەر خانەیـەك بـە ئامـانجی خـۆی و بـەجێهێنانی ئەرکەکانیان. لەو پەڕی هەستیاری و ڕاپەڕاندنی هەزارەها فـەرمان لـە ساتێکدا، ئاوەزی مرۆڤ لە لوتکەی دەرکەوە بەرەو بناری حەپەسـاوی گلۆر دەکاتەوە. ئـەو شـانانەی کـە لەهـەمان خانـەوە دروسـت بـوون، دواتر هەر یەك بە شێوازی دەزگـای بیـنین، بیسـتن، چەشـتن، ...کـار دەکەن و گەدە، ڕیخۆڵە، جگەریش هەروەکو ئەزموونگایـەکی مـۆدێرن لە کـاردان. ئەندامـەکانی نـاوەوەو دەرەوەی جەسـتە لەسـەر بنـەمای پاراستن و هاریکاری و سیستەمێکی کەم ناوێك ئەسـتەمە . هـەر بۆیـە

هەموو ئەمانە ئامادەن بۆ پلانێکی هەستیارو تۆکمە، کە ئەم بونیاتە سەیرەی لەسەر بونیات نراوە .

تێکشکاندنی ئەو پاروەوە خۆراکەی کە لە دەرەوە دێت و هەرسکردن و مژین و گواستنەوەی بۆ جێگەیەکی پێویست و دەرهاویشتنی پاشەڕۆکان، پەیڕەوی یاساگەلێکی ڕێکخراو و ئەندازەگیرکراون. ئەو زانایانەی کە سەرنجی ئەم ڕاستییانە دەدەن، لە ئاست ئەم هەموو مەزنی و فەرهەنگییەدا دەستەوسانی و پەرۆشی خۆیان دەردەبڕن.

لە مێشکی مرۆڤدا ١٠ ملیار دەزگای بڕیاردان بوونی هەیە، لە هەریەك لەم دەزگایانەدا نزیکەی ٢٠٠٠سیناپس (sinaps)[1] هەیە کە لەهەر ساتێکدا سەدەها ڕووداو لێیانەوە دەگوێزرێنەوە، هەروەها هەر یەك لەو ملیۆنان (sinaps) بە جودا ئاگاداری ئەوانی ترەو پەیوەندی و ئاگادارکردنەوەی ئاڵوگۆڕ کراو لە نێوانیاندا لە ئارادایە. بەم شێوەیە مێشك و کۆئەندامی دەمارمان، (مەملەکەتێکی ناوازە)ی چاو ئەبڵەقێنە. سۆماکانتان بە هەر لایەکدا وەرچەرخێنن، هونەرو کارزانی دڵڕفێنی بەدیهێنەری خاوەن شکۆ دەبینن.

ئەم تێگەیشتنە بۆ مرۆڤ هەم ژیانێکی ڕێکوپێك و هەم هەستێکی سوودمەند و هەم سەرکەوتنێکی بێ پایان دەستەبەر دەکات.

---

١- سیناپس: بریتییە لە شوێنگەی بەیەکگەیشتنی دەمارە خانەکان و ئامارە پەڵسەکان لێیانەوە گوزەر دەکات و دەگوێزرێتەوە.

زەنگ لێدرا، بۆ ئەوەی هیچ بیروبۆچوونێك بێتەكایەوە كە پەیوەندی بەبابەتەكەوە هەبێت یان بۆ ئەوەی هیچ ڕاڤەیەك بكرێت، هاتینە دەرەوە. بەڵام پێشبینی ئەوەم دەكرد كە محەمەد، یان هەندێك لەو قوتابییانەی كە پشتگیری بۆچوونەكانی محەمەدیان دەكرد بێن بۆ ژوورەكەم، چونكە دەبوو شتانێكی زۆرتر دەربارەی ئەم بابەتە بوترایە و بوترێن.

## ڕێزم لە محەمەد دەگرت

لەڕاستیشدا هەروابوو، لە پێشبینیەكەمدا بەهەڵە نەچووبووم، كاتێك گەیشتمە بەردەم ژوورەكەم دەبینم محەمەد لەبەردەم دەرگاكەدا چاوەڕێ دەكات. پەیوەندییەكی زۆر گەرم و گوڕم پیشاندا. هێنامە ژوورەوەو دەستم گوشی و داوای چایەكم كرد بۆی و وتم:

محەمەد! كاتم زۆرە، بەئاسودەیی دانیشە، بڕوام وایە كە ئەم جۆرە یەكتربینین و قسەكردنانە دۆستایەتیمان بەهێز دەكات و هەلێكمان بۆ دەڕەخسێنێت سوود لەبیروڕاكانی یەكتر وەربگرین. محەمەد بەئاست و هەستێكی بەرزو شیرینەوە دووا، من زیاتر محەمەدم دەهێنایە گۆو بەو جۆرە بیروڕاكانی ئەوم بۆ دەردەكەوتن. بەبێ پیشاندانی هیچ جۆرە كاردانەوەیەك و بە بێدەنگی گوێم لە محەمەد دەگرت، تەنانەت لە بابەتە زۆر ناڕەحەت و توندڕەوەكانیشی، پاشانیش بەبێ هیچ ئازاردانێك و شكاندنێك و بێ

ئـەوەی قەڵسـی بکـەم، بیرورِاکـانی خـۆمم تێدەگەیانـد. تەنانـەت لەکاتێکیشدا کە بەرپەرچدانەوەیەکی توندوتیژی هەبوایـە پـێم دەوت: "بـەرِێزەوە تەماشـای ئـەم جـۆرە بیرکردنەوانـەت دەکـەم، نرخانـدنی جیـاواز زۆر ئاسـاییە. بـەجیاواز سـەیرکردنی بابەتـەکانیش دۆستایەتییەکان ناڕوشێنێت. "هەمیشە ڕێزم لێ دەنـا، دەمویست کـە ڕێـزی خـۆمی بـۆ دەربخـەم. بـە بـەرەو پێشچـوونی گفتوگۆکـان و، بەهاتنەکایەی بیرورِاکان و، بەوەڵامدانەوەی پرسیارەکان، تێگەیشتنی بەرامبـەر و سـنگ فراوانـی بـەردەوام زیـاتر دەبـوو وەك بلێـی لەسـەر بابـەتێك پێـك هـاتبین، لەبەرامبـەر قوتابییەکمـدا کـە بێبـاوەڕی و نکوڵیکردنی (هـەر بابـەتێك کـە پەیوەندییـەکی دوورو نزیکـی بەپرسـە مەعنـەویی و دینییەکانـەوە هـەبێت) ناسـرابوو، وەك بلێـی لەسـەر بابەتێك هـاوڕابین و پێکهـاتبین. ئەمـە گوتـەی خـۆی بـوو، کاتێـك کـە هەستایە سەرپێ و مۆڵەتی چوونە دەرەوەی خواست، دەستی بۆ مـن درێژکرد و وتی:

(مامۆستا من زۆر سوپاست دەکەم بۆ ئەم گفتوگۆیە، بڕوام وایە کە بـەردەوام دەبـین لەسـەر ئـەم گفتوگۆیانـە). منـیش هـەموو ئومێـد و دڵسۆزییەکم بۆ محەمەد دووپات کردەوەو، بەڕێزلێگرتنـەوە بـەڕێمکرد و خواحافیزیی کرد. زۆر دڵخۆش بووم بە بەرەوپێشچوونی دۆستایەتی و هاوسەنگبوونی دڵسۆزیمان. خۆ ئەگەر محەمەد دوزجەیی لەم فکـرە زیانبەخش و مەترسیدارانە ڕزگاری ببوایە ئەوا دەبـوو بـەمرۆڤێکی زۆر

بەکـەڵك بـۆ دەورووبەرەکـەی، وا پێویسـت بـوو کـە ئـەم گفتوگـۆ و چـاوپێکەوتنانە زیـاتربکرێن. وانـەکان بـەردەوام دەبـوون، محەمـەد دوزجەیی لەوانەکاندا هەروەك ژیانە شپرزەکەی، لەسەر پرسـیارکردنی زۆر و بـێ مانـا هـەر بەردەوام بـوو منـیش هـەتا لەتوانامـدا بـوو، بـێ دڵشـــکاندن و تورەبـــوون، هـــەوڵم دەدا رێـــزی لێبگـــرم و وەڵامـــی پرسیارەکانی بدەمەوە، تەنانـەت هەنـدێك لـە قوتابییـەکان بەرەبـەرە بەرهەڵستی ئەم حاڵەیان دەکرد و دەیانوت "مامۆستا، بۆچی ئەمەندە رێز لەم گەنجە دەگریت؟ تەنانەت قسەکردنیش لەگەڵیدا هەڵەیە"

نـەخێر... مـن لـەو بـاوەڕەدا نیم، بـۆ هـەر قوتابییـەکی کێشـەدار پێگەیـەك هەیـە بـۆ چارەسـەرکردنی کێشـەکانی، بەنەدیتنـەوەی ئـەو رێگـە چـارەیە نابێـت بوترێـت ئـیتر ئـەم کێشـەیە چارەسـەر ناکرێـت. لەوانەشـە چـارە دۆزی ئـەو گرفتـە پێویسـتی بـە هـەوڵ و تەقـەلای زیاتربێت. وەك سەرنجێك لەسەر ئـەم خاڵـە، مامۆسـتا (بـدیع الزمـان) مـرۆڤ بەکۆشـکێکی سـەد دەرگـایی دەچـوێنێت، ئەگـەر هـەموو ئـەو دەرگایانە داخراویش بن تەنها یەك دانەیان کرابێتەوە، نابێـت بوترێـت کـە کـەس ناتوانێـت بچـێتە نـاو کۆشـکەکەوە، هـەروەها تێمـان دەگەیەنێت کە ئەگەر لەکەسێکدا هەموو لایـەن و ڕەفتـارێکی خـراپ و ڕوخێنەر هەبێت. بەدڵنیاییەوە لایەن و ئاراستە و دەمارێکی تێدایە کە دەکرێت لێی نزیك ببیتەوە و لەوێوە ڕاستییەکانی پیشان بدەیت.ئـەم بۆچوونە لەڕووی پەروەردەییەوە جێگەی بایەخی زۆرە. ئەوکەسانەی

کەوا باسدەکرێن گوایە خراپ بوون و هەڵە و بێ سوودن و دەبێت فەرامۆش بکرێن، پێویستە کەنار نەخرێن و دەمکوت نەکرێن، دەبێت تا دوا وێستگەی گفتوگۆ ئەزموونی جیاوازیان لەگەڵ بەکاربهێنرێت، ئەوسا دەبینیت کە دۆزینەوەی دەلاقەیەك، دەروازەیەك کە بڕوانێتە دڵ ومێشکیان کارێکی گونجاوە و گەیاندنی پەیام پێیان ئەستەم نییە. لەگەڵ محەمەدی دوزجەیی وتوێژێکی باشمان بنیات نابوو. لەکاتێکدا کە بەیەك دەگەیشتین قۆپچەی یەخەی کراسەکەی دادەخست و بەڕێزێکەوە دەچەمییەوەو چاك وچۆنی لەگەڵ دەکردم. تەنانەت هەندێکجار بەگاڵتەوە منیش دەموت: ئەمە ڕێزێکی تایبەتییە بۆ جەنابتان جگە لەتۆ بۆ کەسی دی نانوێنم، محەمەد تۆ جیاوازیت، تۆ هاوڕێیەکی دڵسۆزیت بۆ من، متمانەیەکی زۆرم بەتۆ هەیە بڕوام وایە کە بەو سەرکەوتنەی کە لەدوا ڕۆژدا بەدەستی دەهێنیت هەمووکەس شەرمەزار دەکەیت. محەمەد دوزجەیی بەمانە زۆر خۆشحاڵ دەبوو.

## من بۆ چێژ و کەیف دەژیم

لەبەرئەوەی بەدرێژایی ڕۆژ وانەم دەوتەوە، ماندووبووم، ویستم بچمە ژوورەکەم و کەمێك پشوو بدەم. لەو چایەی کە خۆم ئامادەم کردبوو پەرداخەکەم لێ پڕکرد و تەقەی دەرگا هات و محەمەد هاتە ژوورەوە. بە زەردەخەنەیەکی ئەنەدۆڵییەوە شوێنی دانیشتنم پیشانیداو وتم" فەرموو محەمەد دانیشە، وادیارە خەسوت خۆشی

دەوێیت" پێکەنین. کاتێك سەرگەرمی چا خواردنەوە بووین محەمەد وتی:

مامۆستا دەمەوێت کەمێك لەگەڵتدا گفتوگۆ بکەم:

– گوێم لێتە فەرموو.

بە گوفتارە تایبەتییە ڕوونەکەیەوە وتی: "مامۆستا تۆ لەگەڵمدا ڕاست و جددیت، یان چاوبەستم لێدەکەیت؟" بەو گوزارشتە ڕاستەوخۆیەی کەمێك سەرسام بووم بۆ دەرخستنی ئەمەش بزەیەکم کرد، تۆ گەنجێکیت شایستەی مامەڵەی شێلگیر و جددیت، لە داهاتوودا شتانێکی پڕ بایەخ و باش دەبینم.

یەکسەر بەشەرمێکەوە:

سوپاس مامۆستا، ئایا دەزانیت ئەو ئەرزشەی کە تۆ بۆ منی دادەنێیت، ئومێدم پێدەبەخشێت، هەندێکجار بیردەکەمەوە دەڵێم ئایا ڕۆژێك بێت کە خراپترببم و دەربکرێم؟ یان ڕۆژێك هەڵسوکەوتەکانم ئاسایی ببنەوە و بچمە قاڵبێکەوە کە خەڵکی چی دی پەسەندم بکەن؟ ئەوجا چاوی بڕییە چاوەکانم و چاوەڕێ بوو یەکێکیان پەسەند بکەم.

– منیش: بێگومان دووەمیان.

نەك تەنها بەپەسەندکردنت لەنێوان خەڵکیدا، تەنانەت بەهۆی هەڵسوکەوتە باشەکانتەوە دەست خۆشیت لێدەکەن.

وتی: "مامۆستا وادیارە دیسان خەون دەبینمەوە"

زەردەخەنەیەکی کرد نەیدەویست باوەڕ بکات.

بۆئەوەی زیاتر جددی بین و بچینە ناو بابەتەکەوە هەندێك پرسیارم لێکرد: "محەمەد بە بۆچوونی تۆ ئێمە بۆچی هاتوینەتە بوون؟ بۆچی سەرانسەری دونیا لەخزمەتی ئێمەدایە؟ یانی مەبەستی ژیان چییە؟ بۆچی دەبێت بژین؟

بێ هیچ بیرکردنەوەیەك هەڵیدایە و وتی:

"مامۆستا من فەلسەفەی ژیانم پێشتر باسکرد، من بۆ چێژ و ڕابواردن دەژیم، چ شتێك من دڵخۆش بکات، بەوجۆرە هەڵسوکەوت دەکەم، ژیان بۆ من واتایەك، ڕێسایەکی نییە، تا ئەوەندەی بتوانم بەوجۆرەی کە دەمەوێت ژیان بەسەردەبەم و دواتر دەڕۆم، چی دەبێت بابێ، هەموو شتێك بۆ من کۆتایی هاتووە "یانی ژینێکی بێسەروبەر و بێ بەها، وەك گیاندار و، کردنی هەر شتێك کە بتەوێت، لەدوای مردنیش فڕێدانە لایەکەوە ...

" بەڵێ هەر بەوجۆرە..."

ئەم هەڵسەنگاندنەی هەروەك تیر ناخمی پێکا. ئەمە یەکێکە لەئاکامە زیندووەکانی سیستەمی خوێندن، کەسێك باوەڕی وابێت مرۆڤ لە مەیمونەوە هاتبێت و مانەوەی بۆ چێژ و ڕابواردن بێت، دوای مردنیش لێپرسینەوە لەکردارەکانی نەبێت، کەسێك کە بەمەنتیقێکی وەها گۆشکرابێت چ سوودێکی بۆکەسانی تر دەبێت؟ چ بۆ خێزانەکەی چ بۆ کۆمەڵگاکەی چ بۆ وڵاتەکەی؟ کێ دەتوانێت

کۆنترۆڵی کەسێك بکات کە باوەڕی بە لێپرسینەوە نەبێت لەسەر کردارەکانی؟ بۆ ڕاگرتنی ئاوەها عەقڵێك، مرۆڤێك، پێویستە دەوڵەت چەند پۆلیس و ئامێر و کەرەستە بخاتەگەڕ؟ ئایا ئەگەر هەموو جۆرە ڕێ و شوێنێك بگرێتەبەر دەتوانێت ڕێ لەم هەموو خراپە و زیانانەی مرۆڤ بگرێت؟ یان بەواتایەکی تر، ئایا دەگونجێت کە بەتەواوی ژێر ڕکێف بخرێت؟ ئەی بۆچی ئەم ڕاستییە هێشتا نابینرێت؟ گەڕامەوە بۆ لای محەمەد وتم: "دەتوانم پرسیارێکی ترت لێبکەم؟"

وتی: "فەرموو مامۆستا."

وتم: "خوا پەنابات ئەگەر عەقڵت لەدەستدابێت، بڕۆیتە لای حەکیمێك بتگەڕێنێتەوە بۆ باری ئاسایی تەندروستی خۆت، ئایا پێتوایە چەند کەوتویتەتە ژێرباری قەرزی ئەو حەکیمەوە؟"

وتی: "مامۆستا ئەمە یانی چی؟ دکتۆرێك کە شێتێکی عاقڵ کردبێتەوە هەموو تەمەن دەکرێتە فیدای، چونکە حەکیم دەبێتە هۆی پێشکەشکردنی ژیانێك" باشە ئەگەر چاوەکانت نەبێت و هیچ دونیا نەبینیت، یەکێك بێت و چاوەکانت بداتەوە و دەستبکەیت بەبینین، ئایا بەرامبەر بەو کەسەی کە چاوەکانتی گێڕاوەتەوە چۆن و چەندە سوپاسگوزار و منەتباری دەبیت؟"

-"واتە ژیانێکیش بەو دەدرێت چونکە پێویستە نرخەکەی زۆر بێت."

-"ئەگەر درێژەبدەیت بە بابەتەکە، زمان، دەم، لوت، گوێ، بەکورتی هەموو ئەندامەکان بگریتەوە، پێتوایە چەندە قەرزاربار دەبیت؟

- " ئۆۆۆ... مامۆستا: ئەمە لە هەژمارکردن نایەت، نەك تەمەنێك بگرە هەزارەها تەمەنیش بەشی ناکات، مرۆڤ ئەگەر ببێتە بەندەش هێشتا دەستەوەستانە لەدانەوەی ئەو قەرزە. دیسان گەڕامەوە بۆ لای محەمەد و وتم: "دەی باشە محەمەد" ئەو دنیا زیندەگی و سایکۆلۆجییەی کە تۆ خاوەنیتی، هەموو نیعمەتە ڕێکوپێك و سەرسوڕهێنەرەکانی، ئایا تا ئەمڕۆکە هیچ بیرت لەمانە کردووەتەوە کە بۆچی و لەلایەن کێوە پێت دراون؟ یان ئەگەر پرسیارەکەم بەم شێوەیە بپرسین: لەبەر خاتری دووچاوو، عەقڵ و، زمانێك یان هەریەکێك لە ئەندامەکانی لەش، لەبەرامبەریدا کارکردن وەك کۆیلەیەك بهێنرێتەوە بەرچاو و ئەمە پێویستی عەقڵ بێت، ئایا نابێت بیربکەینەوە کە وەك چی و چۆن قەرزاری خاوەنی بەتوانا و بەخشەری ئەو کۆشکە ڕێکوپێکەی جەستە و پێشکەشکەری جیهانی نایابی زیندەگی و سایکۆلۆجی و ئەوەی کە گەردوونی پڕکردووە لەمیلۆنەها نیعمەت بۆمان؟" ئایا تامەزرۆ نین و نامانەوێت ئەو زاتە بیناسین کە هەموو جیهانی بۆمان ڕامهێناوە و گشت بوونەوەرانی بۆ خزمەتمان تەرخانکردووە؟

"ئایا بەهۆشماندا نایەت کە چی لە ئێمە دەوێت؟"

محەمەد بێدەنگ بوو و بۆماوەیەك خەیاڵ بردییەوە.

## ئایا ئەو زاتە بەخۆڕایی هەزارەها نیعمەتمان پێ دەبەخشێت ؟

لەسەر قسەکردن بەردەوام بووم:

"ئـــەو زاتـــەی کـــە لەژیانمانـــدا بەهـــەزارەها نیعمـــەتی خۆیمـــان پێدەبەخشێت، ئایا هەموو ئەمانەمان بەخۆڕایی دەداتێ؟ ئەمانە هـیچ لێپرسینەوەیەکیان نابێت؟"

محەمەد بە پەژارەیی و شەکەتییەوە وتی:

"مامۆستا، تکا دەکەم نەچنە نێو ئەم باسانەوە، نامەوێت بیر لـەم بابەتانە بکەمەوە. ئەمانە شـتانی زۆر وردن و لەناویانـدا نـاتوانم بێمـە دەرەوە، زۆر ناڕەحەت دەبم، وازم لێبهێنە چـۆن دەژیـم بـا هـەروایش بەردەوامبم.

– ئـەم پەناگیرییـەت چـارەنییە. ئـەو زاتـەی ئێمـەی لـە نـەبوون هێناوەتـە بـوون و نیعمـەت و میهـری بـێ بەرامبـەری پێبەخشـیوین، دەبێت بـۆ ئامانجێك ئێمـەی ناردبێـت. کاتێـك ئێمـەی بـردەوە لێمـان دەپرســێتەوە چـــونکە هـــەموو کـــڕین و فرۆشـــتنێك بەرامبـــەرێك و لێپرسینەوەیەکی هەیە. سەیر بکە دەربارەی ئەم بابەتە زانایـەکی زۆر بەڕێز ئاوا باسدەکات:

" مرۆڤ بۆ بەسەربردنی کەیف و وەرگرتنی چێژ نەهاتووە بۆ ئەم دونیایە، بەڵکو هەمیشە مرۆڤ ڕۆشتنی هاتووەکان و پیربوونی لاوەکان و لەناوچوون و جیابوونەوە دەبینێت. کەواتە مرۆڤ تەنها نەهاتووە بەخۆشی بژی و تەمەنێکی ئاسودەیی و پوخت بەسەربەرێت. بەڵکو ئەو مرۆڤەی کە سەرمایەیەکی مەزنی لەدەستدایە بەمەبەستی بازرگانی کردن و بەدەستهێنانی ژیانێکی جاویدانی و کامەرانییەکی هەمیشەیی نێردراوە".[1]

محەمەد دوزجەیی لەناکاو هەستایە سەرپێ و وتی: مامۆستا، ئەمانە شتی زۆرجەددین، من هێشتا ئامادەنیم گوێ لەمانە بگرم و هەڵیان بگرم. من دونیایەکی تایبەت بەخۆم هەیە، دەخولێتەوە و دەڕۆم. ئەگەر گوێ لەشتی ئاوەها بگرم، یان ئەبێت بگۆڕێم یان ئەبێت خۆم بکوژم، تکات لێدەکەم چی دەبێت، جارێ دەست لەمن مەدەن؟ دیاربوو کە وردە وردە لەناخیدا زریان هەڵدەکات و هەندێك لێپرسینەوە ڕووی تێکردووە.

منیش هەستامە سەرپێ و وتم: باشە، با قسەی تۆ بێت. ئەم بابەتە دائەخەین دواتر یەکتر دەبینینەوە. دەستخۆشیمان لەیەکتر کرد و لەژوورەکەم ڕۆیشتە دەرەوە.

لەپاش چەند ڕۆژێك لەگەڵ محەمەد لەباخچەی زانکۆدا ڕووبەڕوو بوومەوە، دووبارە بەڕێزێکی زۆرەوە سڵاوی لێکردم و بە هەست

---

١- خاوەنی ئەم چەند دێرە مامۆستا سەعیدی نوورسی یە.

ناسکییەکەوە دەستی بۆ درێژکردم. منیش هەندێ قسەی خۆشم بۆ کرد کە دڵی پێ شاد دەبوو. وتی: مامۆستا، هیچ ناگەڕێیت بەدوامدا و هەواڵم ناپرسیت یاخود لەبیرتکردووم؟ منیش وەڵامم دایەوە و وتم:

محەمەد من چۆن تۆ لەبیردەکەم. تۆکەسێکی جیاوازیت کە هەرگیز لەبیر ناکرێیت. دیسان بەشێوە دووانە تایبەتییەکەی خۆیەوە:

مامۆستا شەو زۆر درێژە یان وەرە سەردانمان بکە یان ئێمە بانگهێشت بکە، با ئێمە بێین. لەبەرئەوەی لە زانکۆ کات کەمە ناتوانین زۆر یەکتر ببینین.

وتم: باشە، بەڵام دەزانیت کە لێرە بەسەڵتی دەمێنمەوە، دەتوانم لەکۆتایی هەفتەدا بانگهێشتت بکەم، پێکەوە گەشتێکی بچووک ئەنجام بدەین، هەم میوانداریی تۆ دەکەم و هەم وتووێژی زۆریش دەکەین. پرسیاری کرد و وتی: مامۆستا ئەوە بەڕاستتە؟ وتم: بەڵێ، بەدڵنیاییەوە بەڕاستمە... ویستی قسەی پێوە بناڵێنێت و وتی: یانی بێ ئەوەی پرس بە براژن بکەیت بڕیار دەدەیت؟

پێکەوە پێکەنین.

## محەمەدم بانگهێشت کرد

ماڵەکەم لەشوێنی کارەکەمدا نەبوو، لەبەرئەوە بۆ بەسەربردنی پشووی کۆتایی هەفتە لەگەڵ محەمەد پێکەوە هاتین بۆ ئەو شارەی کە ماڵەکەمی لێبوو. گەشتێکی کورت بەڵام پڕ ماناو دۆستانە بوو. محەمەد میوانی پشووی هەفتەی من بوو، لەپاش بەسەربردنی پشووی هەفتە دووبارە پێکەوە دەگەڕاینەوە بۆ زانکۆ. لەگەڵ محەمەدی میوانم لەماڵەوە تەنها خۆمان بووین، بەو هۆیەی محەمەد لەماڵەکەمدا میوان بوو بەهەستیارییەکی زیاترو ناسکییەکی زۆرەوە هەڵوێستی دەنواند.

دیاربوو زۆر هەوڵیدەدا کە دڵی من ڕاگیر بکات و زویرم نەکات. لەیەکەم ساتی هاتنە ماڵەوەی، چاوەکانی هەمیشە لەسەر کتێبەکان، تابلۆکان، ڕێکی چواردەوری، چاوەکانی لەسەر ئەو گوڵانە بوون کە تێری نەدەخوارد لەسەیرکردنی ڕەنگەکانیان. . بەئاشکرا پێوەی دیاربوو کە لەژینگەیەکی نامۆدایە و پێی ڕانەهاتوە. من و هەموو ئەندامانی خێزانەکەم بۆ دڵ ئاسودەکردنی میوانەکەمان هەوڵی پیشاندانی ئەو میوانداریيەمان دەدا کە لە گەورەکانەوە خووی پێوە گیرابوو، ئەمەش محەمەدی هەم خۆشنود و هەم شەرمەزاریشی دەکرد. بۆ نانخواردنی ئێوارە کەش و هەوا جۆرێکی تر بوو. هەروەك بڵێیت کە خوای گەورە زۆرێك لەجوانی و پێشهاتە پڕ بایەخەکانی یەك

لـەدوای یـەك دەهێنـا، خواردنـە جۆراوجۆرەكـانی سـەرخوانەكە زۆر كاریان تێكرد. كەمێك بەزیادەڕەوی كردنەوە وتی:

– مامۆستا ئەوەندە خواردنەكان ڕێكوپێك و بەلەزەت و خۆشن، وا هەستدەكەم لەسەر مێزی پەرییم. ئارایشی ڕازاوەی ژوورەكە و لـوتفی ناسكی ئێوە، تەواو منی شەرمەزاركردووە، خەریكە لەشـەرما ئـۆقرەم نامێنێت.

بێگومان ئەویش وەسف و ستایشی منی دەكـرد و شـتەكانیش بـەو شـێوەیە نـەبوو كـە باسـیكرد. ئـەو گـەنجێكی زۆر زرنـگ بـوو، بـاش دەیزانی، كـە چ قسـەیەك و لـەچ كاتێكـدا دەیكـات. لـەدوای خـواردن، لەگـەڵ خواردنـــەوەی چـــاییەكانمان، دەســـتمانكرد بەگفتوگۆیـــەكی زۆرخۆش. لەقسەی ئاساییەوە، لە ئاو و هەواوە، كرانەوە تـا گەیشـتە بابەتە گرنگەكان. كاتێك یەك بە یەك باسی بابەتە گرنگەكانمان دەكرد وەك ئەوەی شتێكی زۆرگرنگ كەشف بكات، وتی:

"مامۆســتا وادیــارە ئــەم شــەو زۆر درێــژە دەكێشـێت" پێشـبینی دەكرد، منیش وتم: "بەیانی شەممەیە هەرچۆنێك بێت زانكـۆ پشـووە، هـــەم شـــەومان زۆرە و هـــەم ڕۆژیـــش". محەمـــەد بـــەردەوام بـــوو لەقسەكردن و وتی:

– هەموكاتێك ئاوەهایـە دۆزینـەوەی كـاتێكی گونجـاو نارەحەتـە، پێویستە ئەم شەو زۆر بەجددی هەڵسەنگێنین، بەلایـەنی كەمـەوە مـن بۆخۆم وا بیردەكەمەوە. من لەگەڵ هەموو كەسێك بابەتی گـرنگ بـاس

ناکەم. بەڵام ئێوە جیاوازن چونکە شێوازی هەڵسوڕاندنی ڕووداوەکان و ئەو نرخەی کە دەیدەن بە بەرامبەرەکەتان، کاریگەریی زۆری لەمن کردووە.

مامۆستا ئەگەر ڕێگەم بدەیت دەمەوێت بابەتەکە لێرەوە دەستپێبکەم:

"کەم تا زۆر بیروبۆچوونەکانی جەنابتان دەزانم ئاشکرایە کە جەنابتان لایەنگری بیروبۆچوونێك دەکەن کە تەوەرەکەی خوا و دینەکەیەتی، منیش بەتەواوی لایەنگری پێچەوانەی ئەمەم!

منیش چوومە نێوان ئەم وتەیەوە و وتم:

– ببورە محەمەد لەڕاستیدا من هەندێك پێشبینیم دەربارەی تۆ هەیە، بەڵام هێشتا من بەتەواوەتی تۆ ناناسم ئەگەر تۆ پێت باشە سەرجەمی بنەما فەلسەفی و داواکارییەکانت بەکورتی و پوختی باس بکە، بەم جۆرە بیروڕاکان زیاتر لەیەك نزیك دەبنەوە.

محەمەد وتی: فەلسەفەی من، یان بنەماکانی فەلسەفەی گەنجێتی بێ یاسا، ئەمەیە کە: (مرۆڤ یەکجار دێتە دونیا، لەبەرئەمە دەمانەوێت بەو جۆر و شێوازە بژین کە حەزمان لێیەتی. هەرکۆسپێك کە دەبێتە ڕێگر لەبەردەم ئەو ژیانەی کە دەمانەوێت، جا ئەو کۆسپە هێڵە کۆمەڵایەتییەکان، یان ڕێسا ئاسمانییەکان بن ئەوا بەنەبوو هەژماریان دەکەین و ملیان بۆ کەچ ناکەین. دەستور و یاسا و تێگەیشتنە دینییەکان چەندەها کۆسپی جۆراوجۆر و زۆرە ملێ دەخەنە بەردەم

مرۆڤـەکان و بەتـەواوی دەبنــە ڕێگـر لەبـەردەم ڕابـواردن وخۆشــی و شـادیدا. ئێمـەش بۆئـەوەی بەوشـێوازەی کـە بمانـەوێت بـژین و چـێژ لەژیان وەربگرین وای بۆدەچین نمونەییترین ژیان بریتییە لـەژیانی بـێ یاسایی، بـەجۆرێك کـە پێویسـتی بەیاسـاکانی دیـن و خـوایی نـەبێت. بەکورتی و پوختی فەلسەفەی "گەنجایەتی بێ یاساییە").

بەڕاستی ئەم فەلسەفەیە مەترسییە بۆ بەهاکانی کۆمەڵگە، من زۆر بەهەستیارییەوە گوێم لەو وتانە دەگرت. پێویسـتە بـە زووتـرین کـات ڕێ و شوێنی گونجاو بگیرێتەبەر بەرامبەر ئەمانە، بەڵام چۆن؟

## پێویست بوو بەپێی نەخۆشییەکە دەرمانی پێشکەش بکرایە

هیچ باکی لە بـەکارهێنانی هێـز بـۆ سـزادان و دەرکـردن لـە زانکـۆ، بەترسـاندن و هەڕەشــە و گوڕەشــە نــەبوو. کێشــە لــەکوێوە دەســتی پێکردبێت پێویستە چارەسەریش لـەوێوە بکرێـت. ئـەم ڕێسـایە تـاکو گەنجێك بەدەستبهێنرێت پێویسـتە لەپێشـدا (ئینکـاری و ڕابـواردن)ی وەك ئامرازێك پێ بناسێنرێت، لەبەرامبەر ئەو تەوژمە فکرییەی کە دان بەبوونی خوا و پەیڕەوکردنی ئایندا نانێت، پێویستە میتۆدی لـۆژیکیی و بەڵگەی زانستیی بوونی بەدیهێنەر و ئاتاجی زگمـاکی مـرۆڤ بـۆ دیـن بسـەلمێنن و، ئـەوە ڕوون بکەنـەوە کـە ئـەو لـەززەت وکەیفـەی کـە لەدەرەوەی بازنەی ڕێگە پێدراوەکانەوە چنگی دەکەوێت، نـەك نابنـە

مایەی دەستەبەرکردنی ئاسودەیی و کامەرانیی، بەڵکو هەموو ئەو چێژانە دووگیانن بە سەرەئەنجامی بەسۆ و ناسۆری دڵتەزێن. بەڵێ تەنها بەم شێوەیە دەتوانرێت بەر بەم ڕەوتە هزرییە ترسناکە بگیرێت.

ئەم قوتابیەم کە لەژێر چنگی نکوڵی و بێ سەروبەرەیی و ڕابواردنی ڕەهادا دەتلایەوە، بێئاگا بوو لەوەی کە دەیکرد. دوای ئەوەی کە بەنیگەرانییەوە لێی ووردبوومەوە و پرسیارێکم لێکرد: بە نکۆڵیکردنی خودا و ئاین و پێشێلکردنی هەموو بنەماکان، چۆن خۆشی و بەختەوەرییەکی هەلاوێرت دۆزییەوە؟ لەم ڕووەوە ویژدان و ئەقڵت بەمە ئاسوودە دەبن؟ سەری دانەواند و دوای تۆزێك تێڕامان کە لەکوێوە دەست پێبکات، وەك بە نابەدڵی وەڵام بداتەوە و دەستیکرد بەقسەکردن و وتی:

– بەڵێ مامۆستا ئاسوودەم. بەلایەنی کەمەوە هەوڵدەدەم کە ئاسوودەبم.

نەیدەویست کە زیاتر قسەبکات. با زمانیشی بڵێت ئاسوودەم بەلام هەڵسوکەوتەکانی بەدرۆیان دەخستەوە، خۆیشی دەیزانی کە ئاسوودە نییە و ئێمەش دەمانزانی. وەك بیەوێت خۆی ڕزگار بکات لەسەختیی وەلامەکان و ویستی خێرا بازبدات بەسەر بابەتەکەدا و وتی: لەبیروڕا و بۆچوونەکانتان زۆر چاك تێگەیشتم. یانی هەر ئەبێت ئەم جیهانە دروستکەرێکی هەبێت؟ کارەکان خۆیان لەخۆیانەوە

بەڕێوەناچن؟ سیستەم لەخۆیەوە فراوان نابێت؟ یانی بەهەرجۆرێك بێت ئەمە پێویستی بەخوایەك هەیە؟

ئەم پرسیارە بەبناغەی بیری مونکیر و مادده پەرەستان دادەنرێت. لەوەدەچێت، ئەم پرسیارە بووبێتە سەرەتایەك بۆ چوونە ناو بابەتە سەرەکییەکەوە. یاخود محەمەد دەیویست بەم پرسیارە من هەڵبسەنگێنێت، منیش بۆئەوەی کاردانەوەیەکی هەروا سەرپێیی و ئاماژەیەکی داڕنراو لە بەڵگە نەیەم بەدەستەوە، لەکتێبخانەکەم هەندێك کتێبم هێنایە خوارەوە کە پەیوەندییان هەبوو بە بابەتەکەوە یان لەنێو سەرچاوەکانیشدا شاکارەکانی ((پەیامەکانی نوور)) لەپێش هەموویانەوە بوون.

وتم: "بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم پرسیارە، با ئەم بانگەشەیە بەخاڵی دەسپێکردن پەسەند بکەین: "خوا هەیە، دونیا ئەو دروستیکردووە، دونیا سەرەتایەکی هەیەو کۆتاییەکیشی دەبێت. گەردوون، نە لە خۆیەوە دروستبووە نەهۆکار دروستیکردووە و نەدەرهاویشتەی هەناوی سروشتیشە." ئێستا ئێوە بانگەشەکەی خۆتانتان دەربڕی، منیش بۆ وەڵامی ئەوە بانگەشەیەکی ترم خستە سەری. من هەوڵدەدەم کە بانگەشەکەم بە بەڵگەیەکی عەقڵیی و زیریی و بنەمای زانستیی بسەلمێنم". بەڵام بۆئەوەی وتووێژەکەمان جێگەی خۆی بگرێت و ببێتە بناغەیەك، با وەڵامدانەوە و بەرپەرچەکان لەسەر تەرزی دەمەتەقێ نەبن، بوێژ، قسەکانی تەواو

بکات، ئەوکات لایەنی بەرامبەر دەست بکات بەقسە. وەك بلێت: "باشە" سەری ڕاوەشاند. بەردەوام بووم.

(با بناغەی قسەکردنەکانمان، لەسەر پێوانەیەکی زانستیی و عەقلّیی و ژیریی دروست بن. مەبەستم ئەوەیە کەبلّێین دووکەڕەت دوو چوار دەکات. ئەگەر بلّێین دوو کەڕەت دوو شەش دەکات هیچ ئەنجامێکمان دەست ناکەوێت. لەم بابەتەدا کۆك و هاوڕابووین، سەرەتا ئایا گەردوون بەدیهێنراوە؟ یان بەدی نەهێنراوە؟ یان ماددە نەمرە یاخود سەرەتایەك و دروستکەرێکی هەیە؟ با لێرەوە دەست پێبکەین.)

محەمەد بە سەربادانێکەوە وتی: باشە.

## گەردوون سەرەتایەکی هەیە کەوابێ کۆتاییشی دەبێت

بەم جۆرە لەسەر بنەماکانی گفتوگۆکەمان ڕێککەوتین، ئیتر دەمانتوانی بچینە نێو باسەکەوە. بە شیکردنەوەی (تەقینەوە مەزنەکە) (Big Bong) چووینە ناو بابەتەکەوە. ئەم تیۆرە بە شێوەیەکی زانستیی بابەتی دروست بوونی گەردوون ڕاڤە دەکات و لەم سالأنەی دواییدا زانایانی ڕۆژئاوا دەستیان دایە بانگەشە و پشتڕاستکردنەوەی تیۆری (Big Bong) کە بەگونجاوترین شرۆڤەکاری دیدی قورئانیی لەمەڕ بەدیهێنان دادەنرێت.

"تەقینەوە گەورەکە" پشت دەبەستێت بەو ڕاستییەی کە: گەردوون سەرەتایەکی هەبووە.

بەپێی ئەو ڕووداوە مەزنەی کە بەتەقینەوە گەورەکە ناسراوە: بۆشایی و گەلەئەستێرەکان لەسەرەتادا لە ماددەیەکی گەرم و پێکەوە شەتەکدراو دروستکراون. ئەم ماددەیە لەئاکامی تەقینەوەیەکی گەورەدا بەبۆشایدا بڵاوبووەو، ئەم پارچە بچووکانەش ئەو ماددە و وزەیە بوون کە دواتر گەردوونی لێ دروست بوو، لەپاشدا پارچە وردەکان و تیشکدەرەوەکان بەجۆرێکی گونجاو لە دروستکردنی نەخشەی گەردووندا بەپێی ڕێژە دابەشکران. کاتێك کە زەمینە لەباربوو گەردەکان لەسەر مۆدێلێکی ڕێك و پێك کە لەوەوپێش دیاری کراون دروستبوون. دواتر ئەو میکانیزمانەی کە بەڕێسا و نەگۆڕە فیزیکی و کیمیکییەکان ناسراون هاتنەگۆڕێ، پرۆتۆن و نیوترۆن و توخمە قورسەکان دروست بوون، ئەستێرەکان لەدایك بوون، خۆر هاتە مەیدان و هەسارەکان پێکهاتن.

لەم ساڵانەی دوایشدا لێکۆڵینەوەکان دەریانخست کە گەردوون بەخێراییەکی زۆر لە فراوان بووندایە و گەلەئەستێرەکانیش لە یەکتری دووردەکەونەوە. ئەگەر ئەم ڕووداوی فراوان بوونە پێچەوانە بکرێتەوە، هاتنەوەیەکییەك ڕوودەدات کە گەردوون دێنێتەوە سەریەك ماددەی بنەڕەتی. هەموو ئەم لێکۆڵینەوانە ئەوە دەسەلمێنن کە ئەم بوونەوەرە لە خاڵی (سفر)ەوە دەستیپێکردووە. لەقورئانی پیرۆزدا باسکراوە کە ئاسمان و زەوی لەشەش ڕۆژدا و دونیاش لە دوو ڕۆژدا دروستکراوە.

بێگومان واژەی ڕۆژ لێرەدا بەمانای "ماوە" یان بڕگە و بەش دێت کە خوای گەورە باسی کردووە. لەقورئاندا ڕۆژ واباسدەکرێت کە یەکسان بێت بەهەزار یان پەنجا هەزار ساڵی ئێمە، واتە گوزارشتەکانی قورئان ئاماژەیە بە قۆناغ و بڕگەکانی بەدیهێنان. خوای گەورە سەرەتا ماددەی ئەثیری دروستکردووە کە وەك ئاو شلەو، هەر چوار دەوری گەردوونی داپۆشیبوو، ئاسمان و زەوی لەم ماددەی ئەثیرە دروستکرد. زانای پایە بەرز بدیع الزمان (سەعیدی نورسی) دەربارەی ماهییەتی یەکەمین ماددە کە گەردوونی لێ دروستکراوە، بە ئاماژەدان بە ئایەتی (٧)ی سورەتی (هود) بەم جۆرە دەفەرموێت:

(عەرشی خوای گەورە لەسەر ماددەی ئەثیر جێگیربوو کە لە حوکمی ئاودایە. لەپاش دروستکردنی ماددەی ئەثیر، بووە بە تەوەرەی یەکەمین پرشنگدانەوەی توانستی بەدیهێنەری کارزان. واتە پاش دروستکردنی ئەثیر، ئەم ماددەیە گۆڕا بە جەوهەری تاك کە ئەتۆمە). بدیع الزمان کاتێك باسی چۆنیەتی ئەثیر دەکات دەڵێت: وەك ئاو ماددەیەکی شلە و دەچێتە نێو دروستکراوەکانەوەو تەنانەت باسی ئەوەش دەکات کە کارەبا و تیشك وگەرمی و هێزی کێشکردن و ماددە شلەکانیش لە ئەثیر دروستکراون لە هەموو بەشێکی گەردووندا بڵاوبوونەتەوە.[1]

---

١– بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: وتەکان، ل: (٦٠٥) و، إشارات الإعجاز، ل: (١٩٤).

مادده‌ی ئه‌ثیر کاتێك كه له‌نه‌بوونه‌وه هاتووه‌ته بوون، خوای گه‌وره کردی به بناغه‌ی یه‌که‌م داهێنانه‌کانی و، گه‌رده‌کان به دروستبوونیان له‌م مادده‌یه‌وه، گاز له‌باری شلی و خه‌ستیدا هه‌وڵ و ته‌قه‌لایاندا بۆ خزمه‌تکردن. یه‌که‌مین هه‌ساره‌ش که چووه دۆخی ڕه‌قی و بۆ خزمه‌تکردن سازکرا زه‌وییه‌که‌ی ئێمه بوو.

ئه‌ستێره و هه‌ساره‌کانی ناو گومه‌زی ئاسمان له‌مه‌وبه‌ر گاز بوون، دواتر چوونه دۆخی شلی که وه‌ك بارسته‌یه‌کی ئاگر مانه‌وه، ڕووی زه‌وی پێش هه‌موویان چووه دۆخی ڕه‌قییه‌وه، به‌دروستکردنی توێکڵێك، زه‌مینی بۆ ژیان ڕه‌خساند، به‌م جۆره دروستبوونی زه‌وییه‌که‌مان له ئاسمان و هه‌ساره‌کانی تر له‌پێشتره. ئایه‌تێکی قورئان وه‌ها ده‌فه‌رموێت: زه‌وی و ئاسمانه‌کان پێکه‌وه نوسابوون و تۆپه‌ڵێك بوون، ئێمه ته‌قاندمانه‌وه و له یه‌کترمان جیاکردنه‌وه. له سه‌ره‌تادا زه‌وییه‌که‌مان له‌گه‌ڵ ئاسماندا پێکه‌وه نووسابوون دواتر به‌ڕوونی ده‌ریده‌خات که له‌یه‌کتری جیاکراونه‌ته‌وه. ئه‌م ده‌ربڕینه به‌پێی لێکۆڵینه‌وه‌ی زانستیی هاوچه‌رخیش له‌وپه‌ڕی وردی وگونجاویدایه.

له‌سووره‌تی الأنبیاء ئایه‌تی (٣٠)دا ده‌فه‌رموێت: (هه‌موو زینده‌وه‌رێکمان له‌ئاو به‌دیهێناوه) سه‌باره‌ت به‌شێوازی ده‌ربڕینه‌که زۆربه‌ی زانایان ده‌ڵێن: ئه‌و ئاوه ئاماژه‌یه بۆ مادده‌ی ئه‌ثیر، چونکه ئه‌ثیر هه‌روه‌ك ئاو شل و نه‌رم و ڕوونه لێره‌دا محه‌مه‌د هه‌ڵیدایه و وتی:

(مامۆستا، من دیسان ناتوانم بەوە قایلببم کە گەردوون لەنەبوونەوە دروست بووبێت، واتە چۆن شتێك لەنەبوونەوە دروست دەبێت؟

نەبوون واتە ماددە نەبووبێت. شتێکیش کە ماددەی نەبێت چۆن دروست دەبێت؟)

منیش وتم: با هەوڵی ڕوونکردنەوەی بدەم.

(خوای گەورە لە دوو شێوازدا داهێنانی هەیە (إبداع) واتە لەهیچەوە، لەنەبوونەوە ئەفراندن، داهێنان، ئەویتریان (إنشاء) دامەزراندن یاخود پێکهێنان، واتە بەشێوازی کۆکردنەوە و ڕێکخستنی ئەندامە دروستکراوەکان بۆلای یەکتری و هێنانەکایەی دروستکراوێکی نوێ.

واتە ئەو زاتە ماددەی ئەثیر کە بنەڕەتی گشت ماددەکانە و جەوهەر و تۆوی گەردوونە لەنەبوونەوە بەدیهێناوە. ئەم ماددەیە بە حیکمەتی خوایی تەقیوەتەوە، گەرد و، وزە و، هەموو بەش و توخمەکانی لێهاتووەتە بوون، ئەم بەدیهێنانە بنەڕەتییەش تایبەت بەیەك بار هاتە گۆڕ و ڕوویدا بەدوایدا دەروازەی (إنشاء) و پێکهێنان (کە بریتییە لە ڕێکخستن وکۆکردنەوەی ئەفرێنراوەکان پێکەوە و هێنانەکایەی دروستکراوێکی نوێ)ی والا کرد و ئیدی قسەکردن سەبارەت بەئەفراندنی ئەتۆم و تەنۆلکە بنەڕەتییەکان لەنەبوونەوە بایەخێکی ئەوتۆی نییە. لە یەکەم بەدیهێناندا ماددە بەبڕی پێویست

و تایبەت بەیەك بار بەدیهێنرا. لە هەموو بەهارێكدا ملیۆنـان گـژوگیا و درەخت هەریەكە جیاواز لە شێوە و ڕەگەز و مۆدێل و بۆنی جیاواز لـە بــەهاری پێشــوو زیندوودەبنــەوە. ئەمانــە لــە هــەموو بەهارێكــدا لەنەبوونەوە دروسـتدەبن. بـەلآم پێویسـتە زۆر بەباشـی لەماهییـەت و تایبەتمەندیی فەرمانی ببە لە نەبوونەوە بزانین هەرشتێك بـەپێی ئێمـە نەبوبێت و خۆیشی خاوەنی بوونێكی ماددی نـەبێت، لەلایـەن خـواوە دەزانرێت چونكە سیفەتی زانستیی خـوای گـەورە ڕەهـا و گشـتگیرە، واتە هەموو شتێك دەگرێتەوە، خۆ لەبەر ئەم هۆیە هیچ شتێك نـاتوانێ بچێتە دەرەوەی بازنەی زانستی خوایی، شتێك كە لەبازنەی زانستەوە بچێتە بازنەی بوونی ماددە، بەبۆچـوونی ئێمـە لەنەبوونـەوە هـاتووە، بەلآم ئەمە بەهیچ جۆرێك بەشێوەی "نەبوونی ڕەها" ئـەنگار ناكرێـت، محەمەد وتی:

(مامۆستا، كەمێك زیاتر ئەمە ڕوون ناكەیتەوە؟ ) منیش وتم:

با ئەندێشەی ئەفراندنی شتێك لە نەبوونەوە بكەین كە هیچ مۆدێل و نموونە و شێوە و هاوشێوەی نەبێت. ئەم ڕووداوە بـە بۆچـوونی ئێمـە لەنەبوون و هیچەوە دروست بـووە، كەچـی ئـەو شـتەی كـە لای ئێمـە مۆدێل و هاوشـێوەی ئێمـە نـەبوو، لەبازنـەی زانسـتی خواییـدا بـوونی هەیە. ئەگەر ئـەم دروسـتكراوە بـوونێكی مـاددی نەپۆشـێت و نەیەتـە جیهانی ماددەوە ئەوا ئێمە پێی نازانین، كە هاتیشە بوون دەڵێین: كە لەهیچەوە هاتووەتە بوون. وەلێ ئەمە تەنها توانستی ئاوەزی ئێمەیـە،

ئەمە بەپێی بازنەی زانستی خوایی نییە، دیارە ئەو شتە لەبازنەی زانستی خواییدا بوونی هەیە. بەلام هێشتا بوونی نەپۆشیووە.

محەمەد دووبارە وتیەوە: خوا چۆن ماددەیەکی هەبوو دەکاتە نەبوو؟ ئەگەر دەشلێیت بەلگەم پیشان بدە. ئەگەر دەلێیت (حاشا) توانای لەناوبردنی نەبوونی نەبێت چۆن خوایەکە؟

لە ئاست ئەو هەلوێستە بەجۆشەی محەمەددا بەشێوەیەکی نەرم بەردەوام بووم:

ملیۆنان گژوگیا و درەخت و گەلا و، خەزێنەی میوە و بۆن و بەرامە و شێوە و تەرز کە لە بەهاری نوێدا دروستدەبن، دیسان لە وەرزی زستاندا دەبنەوە بەنەبوو، ئەگەر دارێك بخەینە ناو سۆپایەك و بیسوتێنین، دەبینین کە دارەکە دەبێت بەخۆلەمێش، کێش و ڕەنگ و بۆنی نامێنێت، بگرە ئەگەر خۆلەمێشەکەی و وزەکەی و دوکەلەکەی کۆبکرێتەوە دووبارە دەتوانرێت کێشی دارەکە بەرهەم بهێنرێتەوە. بەلام سیفەتەکانی وەك ڕەنگ و شێوە و بۆن و سیفەتەکانی تری دووبارە ناگەڕێندرێتەوە. چونکە ئەوان بوون بە (نەبوو).

لەئەنجامی هەندێك لە لێکۆلینەوەی زانایانی گەردووناسی لەم سالانەی دواییدا، ئەو ئەستێرە زەبەلاحانەی کە چەند هێندەی هەسارەکەی ئێمەن بەرەو جێگایەکی نەناسراو دەڕۆن کە زانایان ناویان ناون (کونە ڕەشەکان) و لەجیهانی ماددە دەردەچن، هێزی کێشکردنی ئەم کونە ڕەشانەش نزیکە لەناکۆتا (infinity)ەوە.

هەر ئەستێرەیەك یان هەسارەیەكی بكەوێتە بەر یان نزیك یەكێك لەم كونانەوە ئەوا گەرمی، ڕوناكی، دەنگ و هەر تیشكێكی تری قوت دەدات و دەبێتە بیرێكی بێ بن، هەربۆیە ئەم كونە ڕەشانە بەڵگەن لەسەر ڕۆیشتن بەرەو جیهانێكی ئەبەدی و هەمیشەیی.

محەمەد لەدوای ئەوەی كەپەنجەكانی كرد بەناو یەكدا هەناسەیەكی قووڵی هەڵكێشاو وتی:

(مامۆستا، ئایا دەزانیت ئەم ڕوونكردنەوانەت بەتەواوی دڵنیام ناكات، بەڵام ناوازەترین ڕوونكردنەوەیە كە تائەمڕۆ بیستبێتم)

## ئایا ئەم سیستەمە خۆی لەخۆیەوە دەبێت؟

محەمەد وەك ئەوەی شتێكی زۆر گرنگی دۆزیبێتەوە لەناكاو دەستی پێكرد. ماددە ساناكان، بەئاسانیش دروستدەبن پاشان سیستەمی زۆر ڕێك و پێك دێنێتە كایەوە تادەگاتە ئەو ئەنجامە، وانییە؟

بۆ زیاتر ڕوونكردنەوەی بابەتەكە، یانی دەڵێیت: خۆی لەخۆیەوە بووە؟

– دەتوانرێت ئاوەهاش بوترێت.

– بە زەردەخەنەیەكی كەمەوە، وتم:

ئەمە گونجاونییە. واباشە ئەو دروستبوونە ئاسانانەی كە دەڵێیت بەردی بناغەی ماددەكانە كە بریتین لەگەردیلەكان، بناسین، دوایش

دەگەڕێینــەوە بــۆلای وەڵامــی پرســیارەکەمان. بۆناســینی مــاددە، پێویســتە لــە بچوکترین بەشــی مــاددەوە کــە گەردیلــەکانن، دەســت پێبکەین، ئەگــەر ســەرنجێکی ورد لــە سەرچــاوە زانســتییەکان بــدەین دەبینیین کە گەردیلەکان بەبەردی بناغەی گەردوون دەناسێنرێن.

بەکۆبوونەوەی ڕێژەیەکی جیاوازی گەردیلەکان توخمــەکان دروســت دەبن. بەیەککگرتنی شێوە جیاوازەکانی توخمیش گــەرد دێتــە ئــاراوە، ئەم جیهانەی دەوروبەرمان بەبوونەوەرە جیاوازە نەژمێراو و زینــدوو و نازیندووەکانی ناویەوە لەم گەردانە دروستبووە. گەردیلە چ بۆئــەوەی لەناو خۆیدا بەهاوسەنگی بزاوت بکات، چ بۆ پاراستنی پەیوەندییــەکی جێگیر لەگەڵ هاوسێکانیدا، بەیاسایەکی زۆر هەستیار، چوار هێزی بــۆ دانــراوە، بەدرێــژایی بــەردەوامبوونی ئــەم ڕێســا هاوســەنگانە بــوونی ئێمەش گونجاو دەبێــت. بەوشێوەیەی کە یەکێك لەو چوار هێزەی کــە ئــەم یاســایەیان هێناوەتــە مەیــدان نەبوایــە، ئــەوا نــاوکی ئــەتۆم پێکنەدەهات. ئەگەر ئــەو هێــزەی کــە بــەهێزی لاواز ناوزەنــد ئــەکرێت نەبوایــە، ئەلکترۆنــەکانیش نــەدەبوون، وە ئەگــەر هێــزی ئێلــێکترۆ ماگنێتیك نەبێت، گەردیلــەش دروســت نابێــت، ئەگــەر هێــزی ڕاکێشــان نەبووایە دوونیاش نەدەبوو، خۆریش نەدەبوو، ئێمەش نەدەبووین.

بەکورتی نەبوونی یەکێك لەم هێزانــە واتــە کۆتــایی دونیــا. تەنانــەت لەبارێکدا کە یەکێك لەوانە لاواز بێت یان کەموکورتییەکی تێدابێت ئەوا

هەمان ئەنجام دەدات بەدەستەوە. بەدڵنیاییەوە، لێرەدا پێویستە سەرنجێکی وردی ئەتۆمەکانیش بدەین.

ئەگەر تێڕابمێنین لەکۆبوونەوەی پێنج ملیۆن کەڕەت پێنج ملیۆن ئەتۆم تەنها لەیەك سانتیمەتر سێجادا، وائەزانم کە کەمێك لەنهێنی و دەرئاساکانی ئەتۆم و ئەو کۆشکی بوونەوەرە مەزنەی کە لە ئەتۆم دروستکراوە تێبگەین، بەهێنانەوەی نموونەیەکی پەیوەندیدار بەتایبەتمەندییەکەی خۆمەوە هەوڵی ڕوونکردنەوەی ئەو پێگەیشتنە زانستییانەمدا کە زانستی نوێ دەربارەی چییەتی ئەتۆم و بزاوت و چالاکییەکانی پێیگەیشتووە.

با وایدابنێین کە مامۆستای پۆلێکین، (١٥) تا (٢٠) قوتابی لە نێوان خۆیاندا قسەدەکەن بەهۆکاری گەردیلەکانەوە دەنگی هەر هەموویان بەهەمان خێرایی بۆ ئەوەی دەنگی هیچ کام لەقوتابییەکان تێکەڵ بەوی دی ببێت، لەڕێگەی ئەتۆمەکانەوە دەگاتە لامان، هەر هەمان گەردیلەکان ڕووناکی و گەرمی هەر حەوت ڕەنگەکەی خۆر دەگەیەننە ناو پۆل. ئەو گەرمایە کە لە سۆپاکانەوە دەردەچێت بەدەستی گەردیلەکان بڵاو دەبێتەوە بەدەوروبەردا. لە هەمان کاتدا دەتوانین دەنگی ڕادیۆیەکی دوورو هەورەگرمە یاخود دەنگی زەنگ ببیستین ئەم کارەش هەر پیشەی گەردیلەکانە.

ئەگەر سەد هەزارکەس دەوری پۆلەکەمان بدەن، هەر یەکەشیان بە دەنگێکی جیاواز و شێوازی جیاواز زمانی جیاواز بانگمان لێبکەن

هەر هەمان گەردیلە بێ ئەوەی ئەم دەنگانە تێکەڵی یەکتری بکەن بەهەمان خێرایی دەگوازنەوە بۆ ئێمە.

بەڵام ئەگەر ببیستین کە کەسێکی زیندوو و عاقڵ و بەهەست لەیەک کاتدا پێنج شەش کار پێکەوە دەکات، بۆنموونە لەگەڵ یەکێکدا قسە بکات و گوێش لەیەکێکی تر بگرێت هەر لەوکاتەشدا شت بنوسێت و شیکاری هاوکێشەی جۆراوجۆر بکات. دەیکەینە مانشێتی ڕۆژنامەکان و بە هەموو دونیادا ڕایدەگەیەنین و دەیکەینە کەسێکی پێوانەیی. گەردیلەیەکی بچووکی بێ عەقڵ و کوێر و بێ هەست لەیەک کاتدا هەزارەها ئیشی بێ کەم وکورتی و بێ تێکەڵکردن و لەوپەڕی کارزانیدا بەڕێوە دەبات. ئایا ئەمە دیاردەیەك نییە کە عەقڵەکان بوەستێنێت؟

ئەو هێزەی کە لەبچوکترین گەردیلەوە هەتاکو گەورەترین گەلە ئەستێرە بەئەندازەگیرییەکی ورد و هەستیارەوە دەخاتە گەڕ. ئەو هێزەی کە بەزانست و توانستی ڕەهای خۆی ئەم هاوسەنگی و ڕێسایانەی گەردوون بەڕێوە دەبات، دەگەڕێتەوە بۆ کێ و کێ خاوەنیەتی؟! ئەم هەموو ڕێسا و هەماهەنگی و ڕێکوپێکییەی کە عەقڵ لەئاستیدا دەوەستێت، کام ڕێککەوت وکام سروشت دەتوانن بەدیبهێنن؟!

دەمەوێت بڵێم: باوای دابنێین کە بارستەیەك لم و چیمەنتۆ و بەرد و ئاسن هەیە، بەبێ بوونی هیچ پلان و وەستا و پرۆژەیەك. ئایا

ئەندێشەی ئەوە دەکرێت کە ئەم ماددە و کەرەستانە یەك بگرن و کۆشکێك دروست بکەن؟

ئەی ئایا شتی ئاوەها گونجاوە کە کۆشکێك بێ کەم وکورتی و لەوپەڕی کەمالّدا لەخۆیەوە دروست ببێت؟ دەگونجێت وا گومان بەرین کە بەدۆزینەوە و ڕاڤەکردنی سیستەمە ناوازەکەی گەردوون و ڕێسا مەزنەکانی، بابەتەکە کۆتایی دێت و نوکتە دادەنرێت؟ بۆ دۆزینەوەی یاساکان کار دەبڕێتەوە؟ ئایا بۆچی ئەو دەسەلاّتە ناهێنینە بەر عەقلّ و ژیریی خۆمان کە ئەم یاسایانەی داناوە؟

مرۆڤ خاوەنی عەقلّە کاتێك لەڕێگەی ئەو عەقلّەوە شتێك کەشف دەکەین پێویستە شەیداییمان زۆر زیاد بکات بەرامبەر بە وەستاکەی و هەولّبدەین کە تێبگەین و بزانین ئەو وەستایە کێیە؟ لەبەرامبەر زاتێکی مەزنی وادا لە تۆوێکی بچووکی هەنجیر، دار هەنجیرێکی گەورە و، وەبەرهێنانی هەزارەها میوە لێی و، بەدیهێنانی بوونەوەر و ئەوی لەناویدایە زیندوو و نازیندووە و، لەتەنۆلکە هاوپێکهاتە ئەتۆمییەکان، پارێزەری هاوسەنگی بوونەوەردا بەهۆی چوار هێزی سەرەکییەوە. ئایا دەکرێت مرۆڤ بێ پەیوەندی بمێنێتەوە؟ دوای دۆزینەوەی ئەو هەموو پەنهانی ونهێنییە ناوازانە، خۆکوێرکردن لەبەرامبەر خاوەنی ئەم گەردوونەدا ڕەوایە؟!

## ئایا سروشت دەتوانێت گەردوون دروست بکات؟

محەمـەد قـۆڵی لێهـەڵماڵی وەك ئـەوەی کـە بیـەوێت بـۆ دواجـار پارێزگاری لەبیرو بۆچوونەکانی بکات و بەپەرۆشەوە هەڵیدایە:

(سروشت لەتوانایدایە کە هەموو ئەم ڕێکسـازیی و واتادارییـەی نێـو گەردوون کۆنترۆڵ بکات، سروشـت میکـانیزمی تایبـەتی خـۆی هەیـە) محەمەد پێیوابوو کە ئەم بۆچوونەی ژیرانەیە، بۆ منـیش تـا ئەوپـەڕی سنوور بێمانا و بێکەڵك بوو، بەهەرحاڵ هەوڵی وەڵامدانەوەیم دا.

وتم: کەواتە پێشەکی پێویستە پێناسەیەکی ئەم چەمکە بکـەین کـە بە(سروشت) ناونراوە.

سروشـــت: ئـــاو، خـــۆڵ، هـــەوا و خـــۆرە، بێگومـــان بەگـــەرمی و ڕووناکییەکەیەوە یان دەکرێـت بڵـێین (٧٠٠) توخمـە ئێسـتاش ئەگـەر پرسیار لەو بەدیهێنەرە بکەین کە زوو زوو بەسروشت ناودەبرێت، ئایـا دەتوانێت مرۆڤەکان دروستبکەیت؟

ئایا دەتوانیت ڕووەك و گیانلەبەران بهێنیتە بوون؟

– نا، نەخێر

– ئایا دەتوانیت سیستەمی کۆمەڵەی خۆرەکان ڕێك بخەیت؟

– نەخێر

– ئایـا دەتوانیـت ملیۆنـان ئەسـتێرە و گەلەئەسـتێرەی زەبـەلاح بەڕێوەبەریت و ڕێکیان بخەیت؟

- نەخێر.

- ئەی ئایا دەتوانیت سیستەمێکی نەگۆڕ و ڕێسایەکی ورد بۆ گەردوون بهێنێتە ئاراوە و کاری پێبکرێت؟

- نەخێر

مەگەر ئەوەی ناوی سروشتیان لێناوە ئایا هەر گەردوون خۆی نییە؟ کەواتە بۆمان دەردەکەوێت کە گەردوون خۆی ناتوانێت خۆی دروست بکات، کەواتە ئەو هێزو وزەیەی کە پێی دەڵێن سروشت چییە؟ ئەگەر هێزو توانایەك هەبێت کە فەرمانڕەوایی سروشت بکات، بێگومان کە خودی بوونەوەر خۆی نییە، تاکە ڕێگەیەك کە هەبێت دەبێت خاوەنی گەردوون و، هەڵسوڕێنەری لەتوخم و ڕەگەزی خۆی نەبێت، ئەویش خوای گەورەیە. ناکرێت هەموو ئەو کار و ڕووداوە ڕێکخراوانەی نێوگەردوون بدەینە پاڵ سروشت. چونکە هەر بزاوت و جوڵەیەك ملکەچی ڕێسایەکی تۆکمە و نەخشە بۆدارێژراوە و لەناواخنیدا دنیایەك لەسوود و دانایی بەدیدەکرێت. هەموو شتێك بەپێوەرێکی هەستیار دروستکراوە و هیچ شتێك سەرەڕۆ نییە، هیچ دروستکراوێك بەحاڵی خۆیەوە بەجێنەهێڵراوە، هەموو ئەم ئیشە ڕێك وخاوەن دیسپلینانەش هەرگیز ناگونجێت بدرێنە پاڵ سروشتێکی بێ ئەقڵ و بێ هەست.

بێگومان سروشتێکی بێ توانا کە خاوەن زانست و ئیرادە و هێز نەبێت، ناشتوانێت ببێتە دروستکەر. لەکۆتایی قسەکانمدا،

لەڕووخساری محەمەد وردبوومەوە هەستمکرد کە ترش و لێڵ و ئەندێشاوییە، بەئاشکرا حەپەسابوو، ڕوونیش بوو کە ڕووداوەکان بەو ئاڕاستەیەی کە دەیویست نەدەڕۆیشتن. لەم کاتەدا خانمی ماڵ میوەی هێنا بۆ ئەوەی تێبگات کە گفتوگۆکە کاریگەر بووە یان نا، وەك ئەوەی بیەوێت کۆتایی بە باس و خواسەکەمان بهێنێت، هەڵوێستەیەکی کرد و وتی:

بەسە مامۆستا خالید میوانەکەت ماندووکرد، هەر تۆ قسە دەکەیت، نەختێك بواری میوانەکەش بدە. بەرامبەر ئەم هەستە ناسکە محەمەد قسەی کرد.

وتی: نەخێر ئامۆژن مامۆستا من ماندوو ناکات، ئەم گفتوگۆیە بۆ من زۆر گرنگە، پێویستە زۆر بەدرێژی قسە بکەین، هێشتا لە سەرەتای ڕێگەداین بەدەم میوە خواردنەوە لەسەر گفتوگۆکە بەردەوام بووین و لەم ماوەیەدا زوو زوو قسەکانم دەبڕین، بەناچاری دەبووایە وەڵامی پەیوەندییە تەلەفونییەکانم بدایەتەوە.

ئەو ئێوارەیە بەشێوەیەکی چڕ و نائاسایی زۆربەی قوتابییەکانم تەلەفونیان بۆ دەکردم. هەر قوتابییەکم کێشەیەکی هەبوو، کە بەپێی توانا هەوڵی چارەسەرکردنی ئەو کێشانەم دەدا، کۆتا پەیوەندیم لەگەڵ قوتابییەکی دانیشتووی گوندێکی (ئەدەپازاڕ)دا بوو کە لەئەنجامی نوێژکردن و بالاپۆش بوونییەوە لەلایەن خێزانەکەیەوە بەرهەڵستی دەکرا و گرفتار ببوو. قوتابییەکەم ئاگادارکردەوە کە

پێویستە خێزانەکەی نەڕەنجێنێت و ئازاریان نەدات، چونکە هەندێك شت پێویستی بە کاتە، پێویستە خۆڕاگر بێت. ئەم تەلەفون کردن و بەدەمەوە هاتنە سەرنجی محەمەدی ڕاکێشا وتی:

مامۆستا لەگەڵ قوتابییەکانتدا پەیوەندی دیالۆگی زۆر باشت هەیە، بەڕاستی سەرم سوڕماوە لەوەی کە ئەوەندە هۆگریت بەکێشەی قوتابییەکانتەوە، ئایا پێتان وایە ئەوەندە پێویست دەکات؟

وتم: «بەڵێ» زۆریش پێویستە ئەمەش دوو هۆکاری هەیە:

یەکەمیان: کەسێك کە باشترین تێگەیشتنی هەبێت بۆ قوتابی و توانای یارمەتی و چارەسەری کێشەکانی هەبێت مامۆستایە.

قوتابی پێویستە متمانەی بە مامۆستاکەی هەبێت، ئەگەر ئەم متمانەیە دروستبوو قوتابی بێ ئەوەی کێشەکانی هەڵڕێژێتە ناو ماڵ و، کۆمەڵگا و شەقامەکان، بەشێکی زۆریان لە قوتابخانەدا چارەسەر دەکات، بەم جۆرە ئێمە پێویستە لەم بوارەدا یارمەتیدەربین.

دووەمیان: من کاتێك قوتابی بووم هەژار بووم. مامۆستاکانم لە پڕکردنەوەی بۆشایی و پێداویستییە ماددی و مەعنەوییەکاندا زۆر فیداکارییان نواندووە و بوونەتە مایەی یارمەتیدانم، ئەگەر یارمەتییان نەدامایە لەوانەیە کە قوتابخانەم تەواو نەکردایە زوو لەژیان بتۆرامایە و ببومایە بەکەسێکی زیانبەخش بۆ کۆمەڵگا.

منیش ئەمڕۆ بەهۆگریم لەگەڵ قوتابییەکانم و هەوڵدان بۆ چارەدۆزی کێشەکانیان کەمێك لەو ئەرك و ماندووبوونەی مامۆستاکانم

دەدەمەوە و ویژدانم ئاسوودە دەبێت. محەمەد بۆ ماوەیەك سەری داخست، هەروەك ئەوەی بۆ شتێك بگەڕێت، دواتر دەستیکرد بەقسە و وتی:

خۆزگە مامۆستا، هەموو مامۆستایەك لەگەڵ قوتابییەکانیدا ئەوەندە پەیوەندی هەبوایە، باوەڕ ناکەم کە ئەو هەڵسوکەوتە خراپانەی کە لە خەڵکدا دەبینرێن، پێش ئەوەی کێشەکە بەتەواوی دەستی پێبکردایە چارەسەر دەکرا. چونکە زۆرینەی کێشەکانی ناو خەڵك و کۆمەڵگا لەنەبوونی پەیوەندییەوە پەیدا دەبن .

محەمەد، ڕاستیی شتەکانی باسدەکرد هەروەك بیەوێت نموونە بهێنێتەوە چونکە خۆی لەناخی ئەو ئازارانەدا ژیابوو.

محەمەد کە میوەکەی تەواو کرد ویستی دەست بشوات و مۆڵەتی خواست، پێکەوە هەستاینە سەرپێ، کە محەمەد دەستی شت خاولیمدا بەدەستییەوە تاکو دەستەکانی بسڕێت.

وتی: (مامۆستا چۆن شتی وا دەبێت؟!) ڕەنگی دەموچاوی سوورهەڵگەڕاو وتی: زۆر شەرمەزارم دەکەیت.

منیش وتم: (نەخێر محەمەد هەم لەدین و هەم لەنەریتەکانی ئێمەدا میوان ڕێزو پلەی تایبەتی هەیە. ئێمەی موسڵمان باوەڕمان وایە کەمیوان سەر بەڕزقە و هەرگیز نابێتە ئەرك و قورسایی).

محەمەد سەری نەویکرد و وەڵامی نەدایەوە. من دەمزانی کە محەمەد جگەرە دەکێشێت بەڵام لەبەر هەست ناسکی لەلای من

نایکێشـێت، بەمەبەسـتی ئاسـوودەکردنی وتم: فـەرموو بچـۆرە باڵەکۆنەکەوە و نەختێك دوکەڵ بکە بەسەروچاوتدا، دواتـر بـەردەوام دەبین. محەمەد وتی: زۆر زیرەکیت مامۆستا، کە ئەمەی وت چووە باڵکۆنەکەوە.

## خوای گەورە دونیای بۆچی دروستکردووە؟

دوای ئـەوەی محەمـەد جگەرەکـەی کێشا، بەرامبـەر بەیـەك و لـە بەردەم ئەو مێزەدا کە کتێبەکانی لەسـەربوو لـەدارگوێز دروستکرابوو دانیشـتین. محەمـەد ماوەیـەك چـاوی گێـڕا بـەو تابلۆیانـەی کـە بەدیوارەکـەدا هەڵواسـرابوون، پاشـان چـاوی بڕییـە تابلۆیـەکی سـەرنجڕاکێش و لەتابلۆکـەدا دیمـەنی وێنەیـەکی زۆر نایـاب هـەبوو و لەخوارەوەشیدا نووسراوێکی لەسەر بوو بەم شێوەیە:

(تـۆ لێـرەدا میوانیـت، لێرەشـەوە بـەرەو شـوێنێکی تـر دەچـیت، کەسـێك کـە میـوان بـوو، دڵـی نابەسـێتەوە بەشـتێکەوە کـە بـەجێی دەهێڵـێ و لەگـەڵ خۆیـدا نایبـات، هـەروەك چـۆن لـەم ماڵـەدا جیـا دەبێتەوە، لەم شارەش دەڕۆیتـە دەرەوە، هـەروەها بـەو شـێوەیەش لـەم دونیـا فانییـەش دەڕۆیتـە دەرەوە، مـادەم وایـە هەوڵبـدە بـە سەربەرزی بچیتە دەرەوە).

ئەم تابلۆ جوانە و وتە پڕ ماناکەی، ژیریی محەمەدیان هەژاند.

ماوەیـــەك بـــەم شـــێوەیە حەپەســـا و ورد ورد بـــیری لێکـــردەوە. لەدوایشدا زۆر بەقورسی و هەروەك بڵێیت پێی نابێت بەجەرگیدا وتی: (مامۆستا، ئەبێت خوای گەورە بۆچی دونیای دروســتکردبێت؟ ئەگـەر دروســتی نەکردایـە، ئـەوا مـرۆڤ و دونیـاش نـەدەبوون. ئەمەنـدەش کێشەو ناڕەحەتی نەدەبوو؟)

وادیـــاربوو کـــە ڕاســـتیی ئـــەوەی (دونیـــای فانییـــە) لەمێشـــکیدا دەزرنگایەوە. ئەو پرسیارانەی کە دەیکردن پرسیاری سووك و ئاسان نەبوون، پرسیارانی زۆر گرنگ بوون کە بناغـەی بابەتـەکانی ئیمانیـان پێکـدەهێنا، ئەگـەر بـەجوانی لەمانـە تێنەگەیشـتبایە ئـەوە لێڵیـی مێشـکی ڕوون نەدەبوویـــەوە. دوای ئـــەوەی کـــە گرنگییـــەکی زۆرم پیشاندا، وتم:

پرسـیارەکانی تـۆ زۆر نـاوازەن، ئەمـە ئـەوە نیشـاندەدات کـە تـۆ چەندە زیرەکیت، پاشان وەڵامم دایەوە:

دروســـــتکردنی گـــــەردوون، ویســـــت و هەڵبـــــژاردنێکی (اللە)یـــــە، پرسیارکردن دەربارەی هۆکارو بۆچییەتییەکانی ئەم هەڵبژاردنە وەکو مرۆڤێکـی دروسـتکراو ناکەوێتـە ئەسـتۆی ئێمـەوە، ئەگـەر پیـاوێکی دەوڵەمەنـد بەسـۆزێك کـە لەدڵیـەوە هـەڵقوڵابێت، ئەوکەسـانەی کـە نـەدارن پۆشـتەیان بکـات، خواردنیـان دەرخـوارد بـدات و خـەرجییان بکێشێت، دڵخۆشیان بکات، دواتر یەکێك لەناویانـدا ڕاسـت ببێتـەوە و خۆی هەڵقورتێنێت و پرسیار بکـات و بڵێـت: هـەموو ئەمانـەت بۆچـی

کـرد، نەئـەبوو ئەمانـەت نەکردایـە؟ چـەندە بێڕێزیـی و نابـەجێیی نوانـدووە!! خۆدەرپەڕانـدن و پرسـیارکردن دەربـارەی ئـەوەی کـە بۆچی خوای گەورە ئەم بوونەوەرەی دروستکردووە لەسەرەتادا ئەمە ناڕێزییەکە، لەڕاستیدا ئەگەر خۆمان هەستین بەپێی پێوانەی عـەقڵیی خۆمان دەست بکەین بەڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە، هیچ ئەنجامێکمان دەست ناکەوێت. لەبەرئەوەی دروستکەر (خوای گەورە) ئەگـەر خـۆی ڕوونـی نەکاتـەوە کـە بۆچـی ئـەوەی دروسـتکردووە، ئـەوا ئێمـەی دروستکراو ناتوانین ئەمە ڕوون بکەینەوە، ئەگەر ڕوونیشـی بکەینـەوە ئـەوا هـەر کـەم وکـورت و ناتـەواو دەردەچـێت، بـەڵام لـەڕووی وەڵامدانەوەیەکی کەمیش بێت بۆ ئەم پرسیارە دەتوانین بڵێین:

لەسەرەتادا پێویستە ئەوە ڕوون بکەینەوە کە الله هیچ پێویستیی و نیازمەنـدییەکی نییـە لەبـەدیهێنانی بوونـەوەر، بەواتایـەکی تـر پەروەردگاری مەزن نیازمەند و ئاتاجی بەدیهێنان نییـە. بـەڵکو ئەمـە تـەنها ویسـت و هەڵبژاردنێکـە کـە زاتـی خـۆی دەیزانێـت. گـرنگترین هۆکاری بەدیهێنانیش بریتییە لە: ویست و ئیرادەی خوایی بۆ بینین و پرشنگدانەوەی ناوە جـوان و کەماڵاتـە مەعنـەوی و بـێ وێنەییەکـەی زاتی خۆی لەسەر ئاوێنەی بوونەوەران.

مەبەسـتم ئەوەیـە کـە ویسـتی خۆیـەتی کـە دەیـەوێت ڕەهـایی زانسـتی، ناوازەییـەکانی، توانسـتی، ڕەنگدانـەوەی جوانییـەکان و،

فراوانی دەوڵەمەندی و دیمەنەکانی سۆز و بەزەیی لەئاوێنە و سکرینی بوونەوەراندا تەماشا بکات.

یانی وەکو وێنەکێش، کەدەیەوێت سەیری ئەو وێنەیە بکات کە کێشاویەتی؟ دەتوانرێت واش بوترێت.

وەکو دەزانین یاسایەکی بەناوبانگ هەیە دەڵێت: (هەموو خاوەن جوانی و کەماڵێك حەز دەکات جوانی و کەماڵی خۆی ببینێت و پیشانیشی بدات). ئەم ئارەزووەش وەکو ئەوەی کە خۆت وتت دەگونجێت لە وەستایەکی دەست ڕەنگینیشدا ببینرێت. بۆ نموونە؛ کەسایەتییەکی وێنەکێش تابلۆی جۆراوجۆر دەکێشێت لەپێشدا خۆی سەیری بەرهەمەکانی دەکات و جوانی دەست ڕەنگینییەکەی تیادا دەبینێت و لەزەتێکی لەڕادەبەدەر وەردەگرێت. دوای ئەوەش پێشەنگا دەکاتەوە و پیشانی تەماشاکەرانی دەدات، لە پیرۆزبایی و سوپاسەکانی ئەوان دڵخۆش دەبێت. لەلایەکی ترەوە زانایەکی خاوەن زانستێکی بەنرخ، کتێبی زۆر بەسوود دەنووسێت و، دەیەوێت خەڵکی تریش سوودمەندبن لەزانستەکەی کاتێك دەبینێت خوێنەرەکانی سوودی لێوەردەگرن و سوپاسەکانیان دەبینێت، بەهۆی ئەم دەست ڕەنگینییەوە چێژی لەڕادەبەدەر وەردەگرێت.

سەبارەت بەوەی کە خوای گەورە بوونەوەرانی دروستکردووە دەتوانرێت لە ڕوانگەی ئەم نموونانەوە سەیر بکرێت. خاڵێکی تر دەربارەی ئەم بابەتە کە پێویستە بزانرێت ئەوەیە کە: خوای گەورە

لـه فەرموودەیـەکی قودسـیدا دەفـەرمووێت: (بوونـەوەرم دروسـتکرد هەتاوەکو چاکەو سوود و قازانجەکانم بۆ ئەوان بێت نەك بۆ من، واتـە ئـەوان سـوود لـەمن وەربگـرن نـەك مـن لـەوان سـوود وەربگـرم). دروستکراوەکان پێویستیان بەچاودێری و یارمەتی و چاکە و إحسـان و سۆز و بەزەیی خوای گەورە هەیە.

بەرامبـەر ئـەو زاتـە گەورەیـەی کـە خـاوەنی بـەدیهێنانی ئـەم بوونەوەرەیە لەنەبوونەوە و خـەڵاتکردنیان بەگـەورەترین بەخشـش و هێنانـەدی هـەموو پێویسـتییەکانیان و پـەیمان پێـدانیان بـەژیانی هەتاهەتایی، ئایـا دەکرێـت بوترێـت بۆچـی ئـەم گەردوونـەت دروسـت کردووە؟

وادیاربوو کە محەمەد وەڵامی پرسیارەکەی بەتـەواوی وەرگرتبێـت، پرسیارێکی تری کرد:

(مادەم خوای گەورە هەیە، ئەی بۆچی نابینرێت؟ ئیدی لـە چـاخی پێشکەوتنداین، هەموو شتێکی هەبوو دەسەلمێنرێت. ئەگـەر هەبوایـە (حاشا) دەمانبینی؟

چۆن بڕوا بکـەین بەشـتێك کـە چـاومان نایبینێـت و تەکنـەلۆجیاش نەیسەلماندووە؟ ئەم پرسیارە یەکێکـە لـەو پرسـیارانەی کەبـەردەوام لـەنێوان زەمینـەی بـاوەڕو بێباوەڕیـدا جێگـەی زۆرتـرین مشـتومڕە. ئەوکەسانەی کە بێدینی و نکوڵییان وەك بانگشەیەك لـەلا پەسـەندە و بۆ تێگەیاندنی بانگەشەکەیان بەرامبـەر کەسـانی پـاك و بێگـەرد بـەم

پرسیاره و هاوشێوەی ئەم پرسیارانە دەردەکەون وە هەوڵدەدەن کە ڕایان بکێشن بەرەو ئەو لایەنەی کە خۆیان دەیانەوێت.

دوای وەڵامدانـــەوەی تەلـــەفونێکی تـــر کـــە لەلایـــەن قوتابییـــەکی دیکەمەوە کرا، گەڕامەوە بۆ وەڵامدانـەوەی پرسـیارەکە، محەمـەد بـە وریاییەکی زۆرەوە بەردەوام بوو لەگوێگرتن.

چاوی مرۆڤ توانـای بینـینی هـەموو شـتێکی نییـە کـە لەگەردووندا هەیە، دوا پلەی توانـای بینـینی چـاو سـنووردارە، هـەروەك ناتوانێـت شـــتێکی زۆر ورد ببینێـــت بەهـــەمان شـــێوەش ناتوانێـــت هەنـــدێك بوونەوەری ناو خۆی، میکرۆب و بەکتریا، تیشکی سەروو وەنەوشەیی و کارەباش ببینێت، بەڵام بڕواشمان پێیان هەیە.

لەڕاستیدا پێویستە هەردوو چەمکی (بڕواکردن و بیـنین) تێکـەڵاوی یەکتر نەکرێن. بڕواکردن ئیشی بیر و مێشکە، بینینیش ئەرکی چـاوە. چاو هەموو شتێك نابینێت، هەندێك شت بەهزر و گوێ و زمان هەسـت پێ دەکرێن.

جیهانی دەنـگ بـەهۆی گوێـوە و، جیهـانی تـامکردنیش بـەزمان و، جیهانی بۆنیش بەهۆی لوتەوە هەستیات پێدەگرێت.

بـە کەسـێك بوترێـت سـەیری ڕادیۆکـە بکـە بزانـە هەواڵـەکان چـی دەڵـێن؟ ئـەوا ئـەو کەسـە بـەگوێی نـەك بەچـاوی، گـوێ لـە ڕادیۆکـە دەگرێت و هەواڵی دەداتێ. ئەگەر بەکەسێکیش بوترێـت تەماشـایەکی شۆرباکە بکە، بزانە تامی چۆنە، ئـەوا ئـەو کەسـە بەچـاوی نـا بـەڵکو

بەهۆی زمانییەوە تامی شۆرباکە دەکات و ئەگەر بەکەسێکیش بوترێت سەیری ئەو گوڵە بکە بزانە بۆنەکەی چۆنە، هەوڵدەدات کە بەلووتی بۆنی گوڵەکە بکات.

ئەگینا لەڕێگەی چاوەوە نە هەواڵەکان، نە تامی شۆرباکە و نە بۆنی گوڵەکەش نابینێت، ئەی باشە دەبێت نکۆڵی لەمانەش بکەین؟ سەرەڕای ئەوەی کە عەقڵمان هێزی ڕاکێشان و خولانەوەی زەوی بەدەوری خۆردا دەبینێت، ناتوانین نکۆڵی لەمە بکەین بەبیانووی ئەوەی کە بەچاوی خۆمان نایبینین. کاتێک کەسێك باسی مامۆستایەکی میهرەبان و بەبەزەیی و نیاز پاك دەکات سەرەڕای ئەوەی کە ئەمە بەچاوی خۆمان نابینین، ناتوانین نکۆڵیشی بکەین، لەبەرئەوەی ئەو هێزە مەعنەوییانە نەك بەچاو بەڵکو بە عەقڵ و دڵ هەستی پێدەکرێت و دەبینرێت.

کاتێك کە بینایەکی نایابی ئەندازیارێك دەبینین دەڵێین سەیری ئەو دەست ڕەنگینی و کارامەییە بکە، ئەوکات نەك بەچاو بەڵکو بەعەقڵ بۆی دەڕوانین لەبەرئەوەی چاو هونەرەکە نابینێت بەڵکو بەردەکان دەبینێت، ئەوەش کە هونەرەکە دەبینێت ئاوەزە.

ئەوانەی کەدەڵێن بڕوامان نییە بەوەی کەچاو نەیبینێت پێویستە ئەرکی زمان و لووت و عەقڵ و گوێ بخەنە ئەستۆی چاو. بەهۆی ئەم هەڵەیەشەوە کە دەڵێن: (ئەوەی نەیبینم بڕوای پێناکەم) دەکەونە هەڵەیەکی زۆرگەورە و گرنگترەوە. محەمەد دووبارە خۆی

هەڵقورتانـدە قسـەكان و بەپرسـێكی تـر ویسـتی بابەتەكـە ئـاڵۆزتر و قووڵتـر بكات:

– باشە مامۆستا خوا چۆنە و چۆن دروست بووە؟

قسەكردن لەوەی كە خوا چۆنە، لەكێ دەچێت و چۆن هاتووەتـە بـوون، بابـەتانێكن كـە زۆر لـە ژوور و توانسـتی تێگەیشـتن و دەركـی مرۆڤـە و عـەقڵی مـرۆڤ لەئاسـتیاندا كولـە. بـەم شـێوەیە چـوومە نـاو بابەتەكـەوە، چـونكە عـەقڵی مـرۆڤ سـنوورێكی دیـاری كـراوی هەیـە. تێگەیشـتن لـە تایبەتمەندییـەكی ڕەهـا و بـێ سـنووری وەهـا بـەهۆی عەقڵێكی سنووردار و دیاریكراوەوە گونجاو و لۆژیكیی نییە...

ئەمە هەروەك ئەوە وایە كـە هەسـتین بەكێشـانی قورسـاییەكی بـێ سنوور بەكێشانەیەكی یەك كیلۆیی.

پێوانە و بەراوردێكی ئا لەم جۆرە هەرگیز دروست و گونجـاو نییـە، چـونكە بەدیهێنـەری مـرۆڤ و گـەردوون خـوای گەورەیـە و لەڕەگـەز و جۆری بەدیهێنراوان نییە. كاتێك كە سەیری تابلۆیەك دەكەین یەكبینە ژیرانە بڕیار دەدەین كە ئەم تابلۆیە بەدەستی هونەرمەندێك كێشـراوە و لەخۆیەوە نەنەخشێنراوە. بـەڵام دەشـزانین ئـەو هونەرمەنـدەی كـە ئەم تابلۆیەی كێشاوە لەڕەگـەزی (جـۆری) بۆیـەكان، چوارچـێوەكە و پەڕۆ و فڵچەكان نییە، هەرگیز لەوانیش ناچێت. ئەو هونەرمەندەی كە ئـەم تابلۆیـەی كێشـاوە، بەگۆشـت و ئێسـقان و خـوێن و عـەقڵ و ئیرادەیەوە بوونەوەرێكی زۆر جیاوازە و لە ڕەگەزی ئەو تابلۆیـە نییـە

که دروستیکردووه و هەرگیز لەویش ناچێت. کەوایە خوای گەورەش کە دروستکەری گەردوونە لەبەرئەوەی کە لە ڕەگەزی گەردوون نییە و هەرگیز لەدروستکراوەکانی ناچێت، ئێمەش کە دروستکراوی دەستی ئەوین بۆ تێگەیشتن لە دروستکەرەکەمان چەندە هەوڵبدەین کە بزانین لەچی دەچێت، دیارە ناتوانین بگەینە ئەنجامێك. هەر شتێك کە بەعەقڵماندا دێت لەلایەن خوای گەورەوە بەدیهێنراوە. ئەو لەهیچ شتێك ناچێت، لەبەرئەوەی لە وەڵامی ئەو پرسیارانەدا کە دەڵێت: ئەو زاتە لەکێ دەچێت و چۆنە؟ پێویستە بڵێین: ئەو بەدیهێنەرە، بەدیهێنراو لە بەدیهێنەر تێناگات.

بۆ وەڵامی ئەو پرسیارەش کە کێ خوای گەورەی دروستکردووە؟ دەکرێت ئەم وەڵامە کورتە بدەینەوە و بڵێین:

سەبارەت بەبوونی خوای گەورە عەقڵی مرۆڤ ناتوانێت لەوبارەیەوە ڕوونکردنەوەیەکی ئەوتۆ بدات، لەبەرئەوەی مرۆڤ و عەقڵیشی دروستکراون و شتێکی دروستکراو ناتوانێت لەدروستکەری تێبگات و شیبکاتەوە.

بنەمایەکی زۆر بەناوبانگ هەیە کەدەڵێت: بەدیهێنراو ناتوانێت هەموو شتێك دەربارەی بەدیهێنەرەکەی بزانێت، واتە ناتوانێت تێیبگات و پەسەندی بکات و عەقڵیش مەخلوقێکە، کەواتە ئەویش ناتوانێت خالقەکەی بگرێتەخۆ. بۆ نموونە ئەگەر زۆپایەك هەستی هەبێت و بەپێی پێوانەی خۆی هەوڵی ناسینی وەستاکەی بدات،

وەستاکەی خۆی بەپێی خۆی و دەوروبەرەکەی پێوانە دەکات و دەیناسێت، وای بۆ دەچێت کە وەستاکەشی وەکو خۆی دار و خەڵوز بخوات و دوایش خۆڵەمێشی لێدەربهێنرێت و دەست و دەموچاوی ڕەش ببێتەوە و سێ یان چوار قاچی هەبێت. بەدڵنیاییشەوە لەهەر بۆچوونێکیدا هەڵە دەکات و وەستاکەی ناناسێت. مرۆڤیش بۆ ئەوەی بەدیهێنەرەکەی بناسێت و سەبارەت بەو پێشبینی بکات، ئەو پێودانگ و پێوانەیە بەکاردەهێنێت کە خۆی دەیانزانێت یان ئەندێشەیان دەکات. بەهەربارێکدا ئاکامی ئەمەش جگە لە دوورکەوتنەوە لەڕاستی هیچی دی نییە. محەمەد دووبارە هەڵیدایەوەو وتی: مامۆستا بابێینە سەر بابەتی چۆنیەتی هاتنەبوونی خوا، منیش درێژەمدا بە وتەکانم، "سەبارەت بەچۆنیەتی بوونی خوای گەورە، بەم دوو نموونەیە بابەتەکە ڕووندەکەینەوە".

یەکەمیان: بیربکەرەوە لە شەمەندەفەرێك کە گالیسکەی زۆری هەبێت، دەزانیت کە هەریەکە لەم گالیسکانە گالیسکەکەی پێشەوەی ڕایدەکێشێت، بەڵام کەسێك نییە بپرسێت کە بزوێنەرەکە کێی ڕایدەکێشێت، لەبەرئەوەی ئەگەر ڕاکێشەرێك (مەکینە، بزوێنەر)ێك نەبێت کە خۆی و هەموو گالیسکەکانی تر ڕابکێشێت جووڵەی ڕێك و پێك دروست نابێت.

دووەمیان: لە سیستەمی سەربازیدا، عەریفێك فەرمان لە سەرکردەکەی وەردەگرێت، سەرکردەش لەسەرووی خۆیەوە، ئەوەی

سـەرەوەش لەسـەرروویەکی تـری خۆیـەوە فـەرمان وەردەگرێـت. لەئەنجامدا ئیش دەکەوێتە دەستی سەرۆکی گشتیی ئـەرکانی سـوپا، یاخود بەدەربڕینێکی کۆن ئیش دەکەوێتە دەستی پاشا، ئـەی بۆچـی پرسیار ناکرێت، باشە ئەی پاشا فەرمان لە کـێ وەردەگرێـت؟ ئەگـەر پاشاش لەشوێنێك فـەرمان وەربگرێـت ئـەوا لەڕاستیدا نابێتـە پاشـا. تایبەتمەندییەتی بوونە پاشا فەرمان دەرکردنە نەك فەرمان وەرگـرتن وەکو ئەوەی کە لەم نموونانەوە تێگەیشتین کـە دروسـتکەری هـەموو بوونەوەر و گەردوون خوای گەورەیەو ورووژانـدنی ئاوەهـا پرسـێکیش کە کێ ئـەوی دروسـتکردووە بەڵگـەی کاڵفـامی و ژیـر دژییـە، چـونکە دروستکەر ناتوانرێت دروسـت بکرێـت. تایبەتمەنـدبوونی ئـەو قـۆرخی خودی خۆیەتی و پێوانەی عەقڵی ئێمەش لەئاستیدا کول و نەدارە.

## ئێسك و پروسکەکان چۆن زیندوو دەبنەوە؟

بەهۆی سەرلەنوێ پێشکەشکردنی چاوە لەم بابەتـە گـرنگ و جێـی بایەخە دابڕاینەوە، محەمەد بە جۆرێك چووبووە ناو گفتوگۆکـەوە کـە کاتێك چـایەکانی دەبـینی لـە ڕووخسـاریدا ئامـاژەیـەکی نـاڕەزایی بـە دەردەکـەوت هـەروەك بڵێـت: (کـەی کـاتی ئەمەیـە، ئـەم گفتوگـۆ خۆشەتان پێ بڕین)، من لـەکاتی ئـەو گفتوگۆیـەدا ئەگـەر بمویسـتایە بەچـا خواردنـەوە پشـوویەك بـدەین، محەمـەد بـەردەوام دەبـوو لـە پرسیارکردن.

– محەمـــەد، بـــا وادابنـــێین کـــە خـــوا گـــەردوونی ئافرانـــدووە و مرۆڤەکانیشی بەدیهێناوە و بۆ تاقیکردنـەوە ڕەوانـەی ئـەم دونیایـەی کردوون. مرۆڤـەکان بـۆ وەرگرتنـەوەی پاداشـتی ئـەو کردارانـەی کـە کردوویانە، پێویستە دوای مردن دووبارە زیندوو بکرێنەوە.

- ئاخر ئەمەیە کە عەقڵم وەری ناگرێت و ژیریشم ڕەتی دەکاتەوە، مرۆڤ کـە گۆشـتێکی مـردوو و ئێسـقانێکی ڕزیـو، کـە ڕەنگـە شـوێن و بنەچەشی نەمابێت، مردوویـەك چـۆن سـەرلەنوێ زینـدوو دەبێتـەوە؟ ئەمە بەلای منەوە شتێکی مەحاڵە.

بەزەردەخەنـەوە سـەیری محەمـەدم کـرد، ئـەم بـارەی مـنی زۆر خۆشـــحاڵ کـــرد، چـــونکە بـــەردەوامی پرســـیارەکان ئامـــاژەی بەرەوپێشچوونێکی پۆزەتیڤانە بوو، دوای ئەوەی قومێکم لەچایەکەم دا بەردەوام بووم، وتم:

"محەمـەد بەڕاسـتی نـازانم، ئایـا ئاگـات لەوەیـە کـە لـەخودی پرســیارەکەتەوە وەڵامەکەیشــت داوەتــەوە". محەمـــەد یەکســـەر پەرداخەکەی دەستی دانا و بەڕوانینێکی نامۆوە وتی: چۆن؟!

وتم: پرسیارەکەت بەو گریمانەیە دەست پێکرد کە خودا گـەردوون و مرۆڤی بەدیهێناوە و مرۆڤی بۆ تاقیکردنەوە ناردووە بۆ دونیا.

وتی: بەڵێ.

وتم: زاتێك كە گەردوون و مرۆڤەكانی دروستكردووە و مرۆڤیشی بۆتاقیكردنەوە ناردووە، ئایا لەپاش مردن ناتوانێت دووبارە مرۆڤەكان زیندوو بكاتەوە؟

پاش ماوەیەك بێدەنگی، یەكسەر بەدوایدا من بەردەوام بووم، بەڵام ئەم پرسیارە بە بەردەوامی لەئێستاكە و لەداهاتووشدا ئاڕاستە دەكرێت، پێویستە بەپێی پێویست لەسەر وەڵامەكەی هەڵوێستە بكەین، تەنانەت ئەم پرسیارە ڕابووردوویەكی مێژوویی هەیە كە بەم جۆرەیە:

بێباوەڕێك بەناوی ئومەییەی كوڕی خەلەف ئێسكێكی پڕووكاوی گرت بەدەستیەوە و پیشانی پێغەمبەری ﷺ دا، فووی لێكرد و وتی:

خوا ئەم ئێسكە ڕزیوە زیندوو دەكاتەوە، وانییە؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، خوای گەورە گیان دەكاتەوە بەبەری ئەم ئێسكەدا. لەسەر ئەمە سورەتی (یس) ئایەتی (٧٨-٧٩) دابەزی مانای ئەم ئایەتە بەم جۆرەیە: (نموونەمان بۆ دێنێتەوە و بەدیهاتنی خۆی فەرامۆش دەكات، دەڵێت كێ ئێسكی ڕزیو و داتەپیو زیندوودەكاتەوە؟! پێیان بڵێ: ئەوكەسەی كە یەكەمجار دروستیكردووە، زیندووی دەكاتەوە، وە ئەو بەهەموو دروستكراوێك زاناو ئاگایە...)

ئەو خاڵەی كە لەم ئایەتەدا جێگای سەرنجە، هاتنی مرۆڤ بۆ دونیا، واتە ئەو تەواوی و كەماڵانەیە كە لەئەفراندنی یەكەمدا بەدیدەهاتن،

بەوپێیــەی کــە هــەموو مرۆڤــەکان لەنەبوونــەوە هاتوونەتــە دونیــای بوونــەوە. بێگومــان لــەدوای مــردنیش دووبــارە ژیاندنــەوەیان هــیچ سەختییەکی تێدانییە.

بەڵێ، ئــەم دروســتکردنەوەیەی دووەم کــە پێــی دەڵــێن: "حەشــر" لەوانەیــە لــە دروســتکردنی یەکــەم ئاســانتربێت. زانــای بــەناوبانگ مامۆســتا (ســەعیدی نوورســی) لــە نموونەیەکــدا ئامــاژە بەســاکاری بەدیهێنانــەوەی پــاش مــردن دەکــات، بەکۆکردنــەوەی ســوپایەك دەیپێوێت کە لەپێشەوە کۆبووەتەوەو پاشان پەرش و بڵاوبووەتــەوە و پاشتر بەدەنگی بوقێك دووبــارە دێنــەوە جێگــەی خۆیــان، لەیەکــەم کۆبوونەوەدا ســەربازەکان یــەکتریان ناســی و فێــری شوێنەکانیشــیان بوون، دواتر ئەگەر بڵاویش ببنەوە، بــە ئاســانی دەزانــن بێنــەوە یــەك جێگا. سەربازەکانی ئەم سوپایە لەم نموونە سەمەرەیەدا ئاماژەن بــۆ خانــەکانی جەســتــەی مــرۆڤ، ئــەم خانانــەش لــەدوای مــردن و پەرتــەوازەبوونیان بــە کــەڕنای ئیســرافیل (دەنگــی ئــەو کەڕنایەیــە کەتایبەتە بەفــەرمانی کۆبوونــەوەی زەڕڕەکــان لەحەشــردا)و دووبــارە گردبوونەوەیان لەجێگەیەکدا، بێگومان لەیەکەمجار گرانتر نییە.

بەشێوەیەکی گشتی ناتەبا زانینی (حەشــر) واتــە زیندووکردنــەوەی دوای مردن، لەگــەڵ عەقڵــدا لــە دەرك نــەکردن بــە کــەماڵ و نــاوازەیی بەدیهێنانی یەکــەمجار و وردنەبوونــەوە لــەو هونــەرە مەزنــە و گومــان بردنی ئەوەی کە لە (بــەدیهێنراوێکی ســادە و ئاســاییەوە) سەرچــاوە

دەگرێت، لەگەڵ زانینی ئەمەشدا هەموو پزیشکەکانی ئـەمڕۆ سـەریان سـوڕماوە لـە بەرامبـەر بـوونی ژیـانی سەراسـیمەیی مـرۆڤ لەسـکی دایکیدا. دکتۆر (هـالوك نوربـاکی) دەربـارەی ئـەم بابەتـە بـەم جـۆرە دەدوێت:

چۆنیەتی لەناوچوونی ژیانی ماددی و بەرجەستەی مرۆڤ و دووبـارە گەڕاندنەوەشی پاش مردن، ئەکرێت لەژێرییەوە بەدوور بزانرێت، وەلێ پێویسـتە ئـەو ڕاسـتییە لـە یادنەکـەین کـە گشـت تایبەتمەندییـە ماددییـەکانی مرۆڤێـك لـە کارتـە تۆوێـك (شـریتی زانیـاری) کـە بـە (DNA) ناسـراوە دەنووسـرێت کەڕووبـەری (١) لـە (١٠) ملیـاردی سەری دەرزییەکی سەرخڕ داگیر دەکات.

ئەمەش ڕاسـتییەکی زانسـتییە و بەتـەواوی پشتڕاسـت کراوەتـەوە، ئەگەر ئەو کارتە تۆوە توانـای گەشـەکردنی لەخاکدا هەبووایـە، ئـەوا کارتە تۆوی هەموو ئەو مرۆڤانەی کـەهاتوون و دێنـە سـەر زەوی، پـڕ لەپـــەرداخێك دەکـــران و فـــڕێ دەدرانـــە خاکـــەوە، ئەوســـاکە زیندووکردنەوەیان گونجاو دەبوو.

ئەو ڤایرۆسانەی کەچەندەها سەدەیە لەژێر خاکدان و هـیچ جـۆرە ڕەوشـێکی زینـدووش هـەڵناگرن کاتێـك ژینگەیـەکی گونجاویـان بـۆ دەڕەخسـێت دووبـارە ژیـان پێکدەهێننـەوە، ئـەی ئایـا ناگونجێـت مرۆڤێکی مردوو، بەفەرمانی پەروەردگاری زیندوو ببێتەوە؟

خوای گەورە کە گەردوون و هەموو دروستکراوەکانی ناوی بەبێ کەم و کورتی دروستکردووە، بەڕشتنی پەرداخێکی لێوان لێو لە پەرلە بەسەرزەوی و بەفەرمانی (ببە) یەك بەیەك زیندوو دەبنەوە و لەحزووریدا کۆدەبنەوە.

## خوای گەورە چ پێویستییەکی بە بەندایەتی ئێمە هەیە کە داکۆکی لەسەر دەکات و دەفەرموێت: (خواپەرستیی بکەن)؟

لەبەر گەرم و گوڕی پرسیار و وەڵامەکان هەستمان بەوە نەکرد کە چۆن قۆرییەکە خاڵی بووەتەوە، محەمەد زۆر زرنگ بوو زۆر چاك تێدەگەیشت لەو شتانەی کە بۆم باسدەکرد. بەهۆی ئەمەشەوە هەتا دەهات گفتوگۆکەمان شیرینتر دەبوو. بەهۆی بەرەوپێش چوونی گفتوگۆکەمان، بەو شێوە جوانە، لەخوای گەورە دەپاڕامەوە بەمەبەستی کارتێکردنی لەناخەوە نزام دەکرد.

پرسیارێك کە زۆر لەوەوبەر ورووژێنرابوو، محەمەد هەروەك ئەوەی نۆدڵزی کردبێت بەتاسەمەندییەوە پرسی:

باشە مامۆستا، خوای گەورە چ پێویستییەکی بەپەرستشی ئێمە هەیە، وا ناچارمان دەکات بەندەگی بکەین؟ هەڵبەتە زۆرکەس لەبەر زەحمەتییەکانی عیبادەتکردن لەخوا هەڵدێن. نەدەکرا ئەم عیبادەتە هەر نەبووایە؟

بەهۆی ئەو بزەیەی کە هاتە سەرلێوانم، یاخود بەهۆی ئەو سەربادانەمەوە هەستی بەوەکرد کە پێویستی بە ڕوونکردنەوەیەك هەیە.

وتی: "مامۆستا، لەوانەیە ئەم جۆرە پرسیارانە لای ئێوە پڕو پاڵەنتە و بێمانابن، بەڵام بۆمن وانییە. ناچارم هەرشتێك تا لەگەڵ ژێریمدا تەبا و جووت نەبێت بەدوایدا بگەڕێم و بپرسم ئەگینا جۆرێکی تر نابێت."

ئەم دەربڕینانە لەناخەوە و زۆر دڵسۆزانە بوون، وادیاربوو چاوەڕێی داڵدە و هانای دەکرد. وەك دانانی کەسێکی برسی و تینوو لەسەر خوانێکی پڕ خواردن، محەمەدیش زۆر لە دوورەوە بێت بەزۆریش ئەو بابەتە ئیمانییانەی دەکردەوە کە تامەزرۆی بەدەستهێنانی زانیاری بوو دەربارەیان. بەشێوەیەك بابەتەکانی دەورووژاند، پرسەکانی ئاراستە دەکرد و گوێ قوڵاخی وەڵامەکان دەبوو، هەروەك بڵێیت لە قووڵایی بابەتەکەدا مەلەی دەکرد، بەهیچ شێوەیەك نەیدەویست لەم بابەتە بچینە دەرەوە. هەر کەباسێکی تریش ناوکێشی بابەتەکە ببووایە، یەکسەر منی وریا دەکردەوە و دەیوت: (بابێینەوە سەر بابەتەکەی خۆمان)، دەستمکرد بەوەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەی کە پرسیبووی.

بێگومان خوای گەورە پێویستی بەعیبادەتی ئێمە نییە، ئەوە ئێمەین کە پێویستمان بە عیبادەتە، لەبەرئەوەی کە ئێمە پێویستمان

بەپەرستشە، خوای گەورەش سوورە لەسەرئەوەی پەرستشەکانمان بەجێبهێنین. محەمەد چاوی بڕییە چاوم و هەروەك بڵێت (چۆن؟) لەکتێبی (تیشکەکان)ی (بدیع الزمان سعید نورسی) نموونەیەکی پەیوەندیدار بەوەڵامی ئەم پرسیارەم دیتەوە و دەستمکرد بەخوێندنەوەی:

پەروەردگار نەك عیبادەتەکەی تۆ، بەڵکو ئاتاجی هیچ شتێك نییە، ئەوە تۆیت کە پێویستت بە عیبادەتە و لەڕووی دەروونییەوە نەخۆشیت. عیبادەتیش لەحوکمی چارەسازی زامە مەعنەوییەکاندایە، داخۆ ئەگەر نەخۆشێك دەربارەی ئەو نەخۆشییەی کە گرفتاریەتی پزیشکێکی بەبەزەیی و دڵسۆز دەرمانی بەسوودی بۆ بنووسێت و سووربێت لەسەر پێدانی ئەو دەرمانە و نەخۆشەکەش لەبەرامبەر ئەم پێداگرییەی پزیشکەکەدا بڵێت: (تۆ چ پێویستییەکت بەوە هەیە، کە ئاوا سووریت لەسەری؟!) تێدەگەیت کەچەندە بێمانایە.

کە نموونەی ناو کتێبەکەم خوێندەوە، تەماشایەکی چاوەکانی محەمەدم کرد و بینیم کە زۆر بە وردی گوێبیست دەبوو. سەری بەهێواشی داخست و بەدەنگێکی هێواشەوە وتی:

(نموونەیەکی زۆر سەرنج ڕاکێشە).

منیش بەردەوام بووم لەسەر قسەکردن: خوای گەورە، هەروەك بە لوتف و گەورەیی خۆی ئەم گەردوونەی کردووە بەخزمەتکاری ئێمە،

هەرواش بە لوتف و میهری خۆی فەرمانی بەندەگی و گوێڕایەڵیمان پێدەکات. هەتاوەکو بەوانە بگەینە بەختەوەری هەتاهەتایی. هەروەکو چۆن خوای گەورە هیچ پێویستی بەپەرستشی ئێمە نییە و بێ نیازە لە بەدیهێنراوانی، ئاواش یاخیبوونی بەندەکانی هیچ زیانێك بەو ناگەیەنێت، لەهەردوو بارەکەدا، مەسەلەکە تەنها بەرژەوەندی مرۆڤە.

ئیدی فەرماندان بە بەجێهێنانی پەرستشەکان هەزارەها سوود و قازانجی ئادەمیزادی تێدایە.

کەسێك کە عیبادەتەکانی بەڕێکوپێکی بە ئەنجام دەگەیەنێت، بە ژیانێکی زۆر ڕێکوپێك شاد دەبێت و لە دونیاشدا ئاسوودە دەبێت و، لە ئامانج و مەبەستی دروستبوونی خۆی و گەردوون تێدەگات و، ژیانێکی پڕ ئامانج و هەتاهەتایی دەست دەکەوێت. مەگەر بۆ مرۆڤ سەرمایەیەکی دی هەیە کە هێندەی پەرستش و بەندەگی سوودمەند بێت بۆی؟

کاتێك محەمەد گوێی لەوەڵامی پرسیارەکە گرت، دووبارە وەك شتێکی گرنگی دۆزیبێتەوە چاوی بڕییە خاڵێك و پرسی:

"مامۆستا، لەمەسەلەی قەدەردا، ئاڵۆزییەکی دژوار هزرمی داگیرکردووە".

هەروەك ئەوەی بڵێم "چۆن" ڕوانیمە محەمەد. ئەویش لەسەر ڕوونکردنەوەکەی بەردەوام بوو وتی:

"بۆچی خوا بەهۆی قەدەرەوە ژیانی مرۆڤەکان سنووردار دەکات و ئاڕاستەیان دەکات؟ ئەی ئەمە دەستوەردان نییە لە ئیرادەی مرۆڤ و هەڵبژاردنی ژیانی؟"

محەمەد ئەم پرسیارەی بەشێوەیەکی زۆر بە بانگەشە و بەجۆش و خرۆشەوە کرد. هۆیەکەشی ئەوەبوو کە دارای زانیارییەکی هەڵە و ناتەواوبوو دەربارەی قەدەر. زۆر کەس بەزۆری لەبەر نەزانینیان یان بەمەبەست، کاتێك دەیانەوێت خۆیان بنوێنن و (زمان درێژ)ی بەرامبەر ئایین و (حاشا) خوای گەورە بکەن، بەڕەخنەگرتن لە قەدەر دەست پێدەکەن.

کاتێکیش کە بابەتەکان دەوروژێنن، وا دەریدەخەن کە مەسەلەی قەدەریان بۆ هەرس ناکرێت. دووبارە بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە چەند زانیارییەکم یادکەوتەوە کە لەپەیامەکانی نوورەوە سوودم لێوەرگرتبوو و هەوڵمدا بابەتەکەی پێ ڕوون بکەمەوە.

(هەموو بەرهەمێك ئەنجامی پلانێکە، هەموو شتێك بەپێی پێوانەیەك شێوە وەردەگرێت. مرۆڤیش وەهایە. گەورەیی چاو، درێژیی زمان، توانستیی مێشك، نەرمیی پێست و شێوەی ئەندامەکانی تر، ملکەچی نەخشەیەکی دیاریکراوی نەبینراون، هێزێکی تایبەت ئەو گەردیلە و تەنۆلکانەی لەنێو جەستەماندا ئەرکەکانیان بەجێدەهێنن سنووردار دەکات) ئێمە پەرلەی بۆماوەییمان لەخانەکاندا دانەناوە.

تەنانـــەت زانیارییـــە بۆماوەییـــەکانی نێـــو خانەکانیشـــمان نەخوێندووەتـەوە، بـەگوێرەی ئـەو پلانـە ئامـادەکراوە جەسـتەمان دروست نـەکردووە. هـەموو ئەمانـە ئاکـامی زانسـتێکی ڕەهـا و هێـزو دەسـەڵاتێکی نـەبڕاوەن. ئـێ باشـە کـێ خـاوەنی ئـەم سـیفەتانەیە؟ بەدڵنیاییەوە، ئایا دەکرێت جگە لە خوا بیر لەشتێکی تر بکرێتەوە؟

کەواتە هەرئەوە پلاندانەر و دروستکەر.

❁ ئەگـەر بمانـەوێت بچینە نـاو قـووڵایی بابەتەکـەوە، لەپێشـدا پێویستە تیشکی زیاتر بخەینە سەر هەرسێ چەمکی: قەزا و قـەدەر و ئیرادە و لەنزیکەوە دەربارەیان بدوێین.

قەدەر: زانـینی هـەموو شـتێکە لەلایـەن خـوای گـەورە و نووسـینی بەگوێرەی ئەو زانینە. بـەدەربڕینێکی تـر پـڕۆژە و پلانـی گەردوونـە. واتە هەموو ئـەو شـتانەی کـە ڕوویانـداوە و بـوون، یـان ئێسـتا هـەن، یاخود لەداهاتوودا دەبن (ڕابردوو، ئێستا، داهاتوو) لەپەڕاوی قەدەردا تۆمارکراوە.

قـەزایش: جێبەجێکردنی حـوکمی قەدەرەکەیـە. واتـە بـەجێهێنانی ئەوەی لە قەدەردا نووسراوە.

ئـیرادەش: هێـزی هەڵبژاردنەکـەی مرۆڤـە. بەگوزارشـتێکی تـر مـافی هەڵبژاردنی مرۆڤە بۆ یەکێك لەسەرپشکییەکان یاخود نووسـراوەکانی بەردەمی.

محەمەد لەناکا و ڕاچڵەکی و وتی:

"مامۆستا تۆزێك تێكەڵ و پێكەڵ بوو، با تۆزێك ڕوونتری بكەینەوە".

- بۆ زیاتر ڕوونكردنەوەی دەتوانین ئەم نموونەیە بهێنینەوە.

هەموو تایبەتمەندییەكی ئێمە وەك ئەوەی لەكوێ؟ كەی؟ چی دەكەین؟ هەمووی نووسراوە. لەقەدەرماندا نووسراوە كە ئێستا لەگەڵ تۆدا قسە دەكەم، ئەمە قەدەرە و ئەندازەگیرییەكە، قسەكردنیشم لەگەڵ تۆدا، بەجێهێنانی حوكمی قەدەرەكەیە، واتە قەزایە. قسە لەگەڵ تۆ كردنم و نەكردنم و هەڵبژاردنی ئەم گفتوگۆیەمان و بڕیاردانی ئەم گفتوگۆیەش ئیرادەیە.

محەمەد ویستی وای دەرببڕێت كە تێگەیشتووە:

واتە، (قەدەر بریتییە لە پلانێك، كە لەدەرەوەی توانستی ئێمەدایە، نەخشەی ژیانمان دەكێشێت و ناچاری ئاراستەیەكمان دەكات).

وتم: نەخێر بەتەواوی وانییە، كەم و كورتی و ناتەواوییەك هەیە. بۆ زیاتر تیشك خستنە سەر ئەم بابەتە، تۆزێك بابەتی قەدەر ڕوونتر دەكەینەوە.

**دەتوانین قەدەر بكەین بەدووبەشەوە:**

یەكێكیان قەدەری ناچاری و ئەوی تریان قەدەری سەرپشكییە. قەدەری ناچاری، هیچ كاریگەرییەكی ئێمەی تێدانییە. ئەو لایەنانەش وەكو ئەو شوێنەی كەتێیدا دێینە دونیاوە، دایك و باوكمان،

شێوەمان، ڕەگەزمان و تواناییەکانمان. ئێمە ناتوانین بۆ ئەوانە بڕیار بدەین. هیچ بەرپرسیارێتییەکمان لەبەرامبەریاندا نییە.

قەدەری سەرپشکیش پەیوەستە بە ئیرادەوە، ئێمە بڕیاری چی دەدەین؟ چی هەڵدەبژێرین؟ دەمانەوێت چی بکەین؟ خوای گەورە بە زانستە ڕەها و ئەزەلییەکەی ئەمانە دەزانێت و ئەندازەگیریی دەکات و دەینووسێت.

هاتەگۆ و وتی: "زۆر گرنگە"

– منیش: "بەڵێ، هەڵە تێگەیشتن هەمیشە لەم خاڵەدایە".

## ئایا ئێمە مەحکومی قەدەرین؟

ئەم زانیارییانە دەبنە ڕوونکردنەوەیەك بۆ بابەتی (مەحکومی قەدەر) یان زۆرەملێیی قەدەر کە مرۆڤەکان زووبەزوو بەکاریدەهێنن، چونکە بە وتەی مەحکومی قەدەر (حاشا) خوا و قەدەر تاوانبار دەکەن. دەیانەوێت بانگەشەی بۆچوونێکی وا بکەن وەك بڵێیت مرۆڤەکان بێ تاوانن و قەدەر ستەمیان لێدەکات. ئەمە سەرتاپا لە نەشارەزابوون بە قەدەر و تۆمەتبارکردنی ئەو زانستە خواییە (قەدەر)ە بەو هەڵە و تاوانانەی کە مرۆڤ بە ویستی خۆی دەیکات و سەرچاوە دەگرێت تاکو خۆی لە لێپرسینەوە دەرباز بکات. لێرەدا خاڵێکی سەرەکی هەیە کە لێی تێناگەین:

هەر لە لەدایکبوونمانەوە تا مردن، چی هەڵدەبژێرین، داوای چی دەکەین، چ ژیانێك دەگوزەرێنین، چۆن ویستمان بەکاردەهێنین،

خوای گەورە خۆی هەموو ئەمانە بەهۆی زانستی ڕەها و ئەزەلیی زاتی خۆیەوە و بەگوێرەی ئەو ویستەمان قەدەرمان تۆمار دەکات و پێش لەدایکبوونمان دەزانێت، واتە پەروەردگار لەپێشدا بەگوێرەی ویست و هەڵبژاردنەکانی خۆمان، قەدەرمان ئەندازەگیر و پلان ڕێژدەکات، لەبەرئەمە مافی ئەوەمان نییە (حاشا) کە خوا و قەدەر تاوانبار بکەین. تەنها دەتوانین ئیرادەمان تاوانبار بکەین کە بەهەڵە بەکارمان هێناوە.

محەمەد وەك ئەوەی کە شتێکی دۆزیبێتەوە چاوەکانی لەناکاو زیت بوونەوە و وتی:

"بەڕاستی زۆر سەمەرەیە مامۆستا، ئەم ڕاستی و وردەکارییانە هەمیشە چەواشە دەکرێن، هەموو بەرپرسیارێتییەك دەخرێتە سەرشانی قەدەر. بەڵێ، کەوابێت خوای گەورە لەپێشتر هەڵبژاردنی مرۆڤی زانیوە بۆیە نووسیویەتی. لەبەرئەوە بەناچاری و زۆرەملێیی مرۆڤ ئاراستەی هیچ ڕووگە و جێگەیەك ناکات."

محەمەد زۆرباش تێدەگەیشت، تەنانەت لە ئاڵۆزترین بابەتیشدا بەڕوونکردنەوەیەکی بچووك تێر دەبوو و دڵی ئاوی دەخواردەوە. محەمەد لەبنەمای بابەتەکە سەری دەردەکرد، بۆیە پێویستی بەشیکاری زۆر ورد نەما.

"ئایا قەدەر دەگۆڕێت؟ " دوایین پرسیاری بابەتەکەی کرد:

- کەسانێکی زۆرم دیتووە کاتێك کارێك دەکەن لەناکاو کارەکەیان بەجێدەهێڵن و دەست دەکەن بەکارێکی تر و بەم جۆرە دەڵێن: ((ئەوەتا قەدەرەکەمم گۆڕی)) لەهەر جارێکدا پێکەنیوم و وتوومە:

تۆ قەدەر ناگۆڕیت، بەڵکو ئەوکارەی کە دەیکەیت گۆڕیوتە. تۆ هەروەك بەلەمێك وایت لەنێو ئۆقیانووسی قەدەردا ئاڕاستەکەی بەرەو کوێوە ببەیت بەو ئاڕاستەیە دەڕوات، بەڵام خۆ تۆ هەر لەناو ئۆقیانووسەکەدایت.

ئەو کەسەی کە خەریکی نووسینە ئەگەر دەست بکات بەوتنی سروودی نیشتیمانیی، قەدەری ناگۆڕێت. لەمەوە تێدەگەین کە لەقەدەری ئەودا لەپێشدا نووسین دواتر وتنی "ئەوەتا قەدەرەکەم دەگۆڕم" سروود چڕین هەبووە، کردارەکانی دەبنە شتی دی، بەڵام قەدەر ناگۆڕدرێت... بەگۆڕینی شوێنی ئەو ئاوێنەیەی کە درەختێك پیشان دەدات، شوێنی درەختەکە ناگۆڕدرێت.

محەمەد ئەو هەژانە دەروونییەی ناخی هێنایە گۆ و وتی:

"ڕوونکردنەوەیەکی زۆر جوان بوو". شوێنەواری ئاسوودەیی بەڕوونی لە ڕووخساری محەمەددا بەدی دەکرا کاتێك وەڵامی پرسیارەکانی دەست دەکەوت، بەئاشکرا ئەو سەغڵەتی و شپرزەییەی کە لەسەرەتای گفتوگۆکەدا پێوەی دیاربوو وردە وردە ڕەوییەوە.

بریسکەی شادی نێو سۆماکانی و خەندە ناسکەکانی سەر لێوانی هێدی هێدی، گێژەڵووکە سامناکەکانی نێو ڕۆحی هێور دەکردەوە. لەهەوای درێژخایەنی گفتوگۆکەدا بۆئەوەی محەمەد بێزار نەبێت، وتم:

"تا کات درەنگتر نەبووە بانوێژی خەوتنانم بکەم و تۆش ئەگەر حەزدەکەیت دووبارە سەرێك لەباڵکۆنەکە بدەوە." کاتێك کە تێگەیشت چی دەڵێم دانی پێدانا و وتی:

"مامۆستا گفتوگۆکە بەجۆرێك ئێمەی کەمەندکێش کردووە، تەنانەت جگەرەکێشانم بەبیردا نایەت".

من هەستام بۆ نوێژ و محەمەدیش چووە باڵکۆنەکەوە، بەم جۆرە ساتێك پشوومان‌دا و محەمەدیش ئەو بوارەی بۆ ڕەخسا تا هەڵسەنگاندنێك بۆ وەڵامەکان بکات و لە مێشکیدا ئەم دیو و ئەودیویان بکات.

کاتێك چوومە سەر بەرماڵ و بەتەنها مامەوە، هەستم کرد چەندە لەخۆشی و پەرۆشیدام، وەك ئەوەی بڵێیت هەستێك لەناخمدا هەبوو کە ئەرکێکی گران دەستپێدەکات، لەکۆتایی نوێژەکەمدا دەستەکانم بۆ لای خوای گەورە ئاوەڵاکردن و تاکە داواکاریشم ڕێنموونی کردنی محەمەد دوزجەیی بوو، ئای چەندە ئەمەم دەویست کاتێك کە دوعاکانم و داخوازییەکانم پێشکەش بە خوای گەورە دەکرد، دەمێك بوو ئەسرینەکانیشم لەچاومەوە جۆگەیان بەرەو گۆناکانم کێشابوو، لە قوڵایی هەناومەوە هانام بۆ خوا بردوو دەپاڕامەوە و دڵنیابووم کە

خـوای گـەورە ئەوەنـدە دلۆڤـان و خـاوەنی میهرەبـانی و کەرەمـە، داواکارییەکانم ناگێڕێتەوە.

کاتێـك گەڕامـەوە بـۆ ژوورەکـەم، محەمـەد چـاوەکانی دەیڕوانییـە نادیارێــك، هەوڵیــدەدا ئــەو هــەزاران بیرۆکانــەی کــە لەمێشــکیدا دەخولانــەوە ڕیزیـان بکـات، بگـرە بێزاربوویـوو لـە کاریگـەریی ئـەو گێژەلۆوکەیـەی کـە لەدڵیـدا هـەڵیکردبوو، ئاشـکرابوو کـە لـەحاڵێکی لێپرسینەوەدابوو. کاتێك منی بینی هاتمە ژوورەوە خۆی کۆکردەوە و دووبارە بەرامبەر یەکتر دانیشتین.

– محەمــەد بــێ ئــەوەی هــیچ بــوار بــدات لــەو جێیــەدا کــەلێی وەستابووین بەردەوامبوو، وتی:

"مامۆستا، دەربارەی ڕۆحی مرۆڤ دەڵێیت چی؟" سەبارەت بـەڕۆح زۆرێك لەبیرۆکە و دیـدەکانم خوێندووەتـەوە، وەلێ هەریـەك لـەوی دی جودا و نایەکانگیربوون. "دەکرێت پێم بڵێیت: ئەو شتە چییە کە پێی دەوترێـت ڕۆح؟" لەناخــەوە هەوڵمــدا کــە وەڵامــی ئــەم پرســیارەی بدەمەوە کە بۆتە ماخۆلانی محەمەد و وتم:

ئەو زاتەی کـە گشـت بوونـەوەر و ئـەو دیسـپلینە ناوازەیـەی نـاوی بـەدیهێناوە و مرۆڤیشــی ڕەوانــەی دونیــاکردووە، بـۆ هــەر مرۆڤێـك گیانێکی بەدیهێناوە، وەك چۆن دروسـتکراو هەیـە دەبینـرێن و، هـەن کە نابینرێن، ئاوا ڕۆحی مرۆڤیش یەکێکە لەو بەدیهێنراوە نەبینراوانە.

ڕۆح لەخۆیدا خاوەنی ژیان و هەستە، پێش ئەوەی دابەزێتە جەستەوە لەدونیای ڕۆحەکاندا چاوەڕوانە. لەدوای پۆشینی جەستە، هەموو کردارێکی لەگەڵ جەستەیدا دەکات. بەدرێژایی تەمەنی دونیای مەحکومی جەستەیە، لەکاتی مردندا لەبەندیخانەی جەستە ڕزگاری دەبێت، بەڵام بەتەواوی بەڕووتی نامێنێتەوە، جەستەیەکی میسالی یان بەرگێکی جوان دەپۆشێ، دوای مردن جەستە جۆرێکە لە ماڵی ئەو پێویستی بەهیچ هۆیەك نامێنێت، دەبینێت، دەبیستێت، تێدەگات و دەزانێت و هەستدەکات، تا کاتی قیامەت لەجیهانی بەرزەخدا چاوەڕوانیی دەکات، لەم کاتی چاوەڕوانییەدا یان لەخۆشییەکی وەك بەهەشتدا دەژی یان سزای گۆڕ دەچێژێت، بەگوێرەی فەرموودەی پیرۆز گۆڕ یان دەبێت بەیەکێك لەباخچەکانی بەهەشت یان بەیەکێك لەچاڵەکانی دۆزەخ دوابەدوای قیامەت، لەمەحشەردا دەگەڕێتەوە بۆ جەستە بەدیهێنراوەکەی، لەو دادگاییە مەزنەدا کە پاداشتی کردەوەکانی ژیانی دونیای وەردەگرێتەوە.

محەمەد دوزجەیی بەگوڕینی ئاڕاستەی بابەتەکە و بەهەڵسوکەوتەکەیدا دیاربوو کە نیازی پرسێکی گرنگی تری هەیە، لەپاشان پرسی:

بۆچی هەموو ئیمانداریك بەزمانی خۆی نا، بەڵکو بە عەرەبی خواپەرستیی دەکات؟ ئەگەر خوای گەورە گوێبیستی هەموو دەنگێك و لاڵانەوە و نزای هەموو بەندەیەکی دەبێت، کەواتە بۆچی زۆریان

لێدەكرێت تا بەزمانی عەرەبی خواپەرستیی بكەن؟ لەم بابەتـەدا ئایـا پێچەوانەییەك بەدی ناكرێت؟

ئەم پرسیارەش لەم ڕۆژانـەی دوایـدا زوو زوو دەهێنرێتـە كایـەوە، هەنـدێك لەوانـەی كـە ئـەم پرسـیارە دەكـەن ئەوانـەن كـە پـوختیی بابەتەكە نازانن ونیازمەندی فێربوونن.

بەڵام بەشی هەرە زۆرینـە بەمەبەسـتی دەرخسـتنی ڕق و كینـەیان بەرامبـەر ئیسـلام و ئـاوەژووكردنی زیهنەكانـە. محەمـەد یـەكێك بـوو لەوانەی كە نوێنەریی بەشی یەكەمی دەكرد.

هەوڵی وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارەشمداو وتم:

ئاشكرایە، موسڵمانان لەكاتی نوێژدا موكەللـەفن بەخوێنـدنی بەشـێك لەقورئانی پیرۆز. ئەگەر زمـانی دایك و نەتـەوەی موسـڵمانان هەرچـی بێت، ئەم شێوازە لەسەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ نەگۆڕاوە.

لەیەكەم ڕوانیندا بەبیری موسـڵماندا دێـت كـە پەرستشـەكانی بـەو زمانانـەی قسـەی پێـدەكات و لێـی تێـدەگات بەئـەنجام بگەیـەنێت، ئەمەش حاڵەتێكی ئاسایی پێكدێنێت، بەڵام كاتێك كە لەبنج و بناوانی مەسـەلەكە دەكۆڵێتـەوە و گوزەرێـك بەقووڵاییـەكانی بابەتەكـەدا دەكات، ئەوسا تێدەگات كەچەندە وردەكاریی و لایـەنی تـر هـەن كـە پێویستە ئاوڕیان لێبدرێتەوە.

لەپێش هەموو شتێكدا پێویستە جیـاوازیی لـەنێوان دوعـا و نوێـژدا بكەین، دوعـاكردنی دوای نوێـژ پێویسـتیی و داخوازییـەكانی ئیمانـدار

لەبەرامبەر خوای خۆیەوە بەهەر زمانێك بیەوێت دەتوانێت دەری ببڕێت و یاساغ نییە. ئەمە مەسەلەیەکی شەخسییەو پەیوەندییەکی بێ هۆکار و ئامرازی نێوان بەندە و خالقیەتی. سەبارەت بە نوێژیش پەرستشێکی گشتگیر و گەورەیە و پێویستە سەرنج بدرێت لەپێویستیی ئەو ئیماندارانەی تریش کە نوێژ دەکەن و ڕەچاوی باری گشتی بکرێت.

نوێژ لەبناغەدا وا پەسەندە کە بەکۆمەڵ بکرێت و ڕێگەش دراوە کە بە تەنهایش بکرێت، بەڵام لەڕاستیدا نوێژی پەسەند و باشتر نوێژی کۆمەڵە. ئەگەر ئیسلامییەت بەگوێرەی ڕەگەز و میللەت ئاینی هەر ناوچەیەك ببوایە، بێگومان دەبوایە زمانی ئەو ناوچەیە، ئەو ڕەگەز و ئەو میللەتە بەکاربهێنرایە، بەڵام تایبەتمەندییەکانی ئاینێکی گەردوونی وەك ئیسلام، کە لەهەموو ڕەگەز و نەتەوە و ڕەچەڵەکەکان لایەنگری هەیە و خاوەنی ئاینزایانێکی ئەوتۆیە کە بەسەدەها زمانی لەیەکتر جیاواز دەدوێن، بەجۆرێکی دییەوە تەرزێکی تر دەخوازێت.

با وادابنێین تورکێك کە چینی نازانێت بچێت بۆ چین و لەشەقامەکاندا دەنگی وەك (چین چانگ چونگ) ببیستێت، ئاشکرایە کە ئەو لەهیچ تێناگات لەبارێکیشدا ئەگەر ئەو وتانە وەرگێڕدراوی (الله أکبر)ی بانگ بێت دووبارە ئەو سەری تەقەی دێت و نوێژی هەیینی لەدەستدەچێت. (مزگەوتەکانی چین بەهیچ جۆرێك لەمزگەوتەکانی تورکیا ناچن. کە بەهۆی منارەکانەوە لەدوورەوە دیارین). بەهەمان

شێوە موسڵمانێکی چینی کە بەتورکیادا بڕوات ئەگەر موسڵمانانی تورکیا بەزمانی خۆیان پەرستش بکەن هیچ ناوەندێکی هاوبەش نابێت کە ئەم دوو هاوئاینە کۆبکاتەوە. لەم کاتەدا ئایینێکی جیهانی گشتگیر پێویستە هەندێك ناوەندی هاوبەشی هەبێت. ئەمەش پێویست بە بوونی هەندێك بنەمای هاوبەش و گشتگیر دەکات. لەم ڕووەوە بێگومان بانگ و قورئان خوێندن دوو ڕەگەزی سەرەکی پێکدەهێنن.

دەتوانین کۆنگرە و لوتکە نێو نەتەوەییەکان بەنموونە بهێنینەوە: بۆنموونە لەنەتەوە یەکگرتووەکاندا ڕێگە نەدراوە کە هەمووکەسێك زمانی خۆی بەکاربهێنێت، بەڵکو زمانەکانی وەك فەرەنسی و ئینگلیزی بەکاردەهێنرێت، لە پێناو بەرژەوەندیی گشتیدا بەرژەوەندیی تاك وەلادەنرێت.

بابەتەکە لایەنێکی دی هەیە کە بایەخی لەوانی دی کەمتر نییە، ئەویش ئەوەیە کە هیچ وەرگێڕانێك نییە کە جێگەی بنەڕەتەکەی خۆی بگرێتەوە. قورئانی پیرۆز زیاتر لە (١٠٠) وەرگێڕدراوی تورکیی هەیە و هەموو ڕۆژێك دانەیەکی تازەتری بۆ زیاد دەبێت. ئەمە ئەوە نیشاندەدات کە زانا تازەکان پاچەڤەی زانا کۆنەکان بە پێی پێویست نابینن، یاخود واتاکانی قورئان زیاتر لە مانا و ڕاڤەیەك دەگرنە خۆ، کە ئەم تایبەتمەندییەش لەهیچ زمانێکی تردا بەدی ناکرێت، بەواتایەکی دی: قورئانی پیرۆز لەهەر چاخ و سەدەیەکدا پارێزگاری

لەلاوێتی خۆی دەکات. بۆ هەموو زمانەکان بابەتی وەرگێڕانی هەر شاکارێك لەزمانێکەوە بۆ زمانێکی تر جێی قسەو باسە.

لەم حاڵەتەدا بەکارهێنانی واتایەکی ناتەواو باشترە یان بنەڕەتییەکی بێ هەڵەو تەواو؟ جێی خۆیەتی کە لێرەدا ئاماژە بەو ڕاستییە بدەین کە جگە لەئایینی ئیسلام و پەیامە ئاسمانییەکەی (قورئان) هیچ کام لەو پەیامە ئاسمانییانەی کە بۆ پێغەمبەرەکان نێردراون وەك خۆیان نەماون و جیاوازن لە بنەڕەتەکانیان، هەموو ئەو دەق و ڕاڤە و پاشماوانەی کە ئەمڕۆ مەسیحییەکان، جوولەکەکان، یاخود مەجووسییەکان خاوەنین دەستکاری کراون و لە هەموو جۆرە کرۆك و ڕەسەنایەتییەك داماڵراون.

موسڵمانان چەندە بەختەوەرن کە خاوەن نیگایەکی ئاسمانیی مەزنو ڕەسەنن کە ئەویش قورئانی پیرۆزە. با ئەوەشمان لەبیر نەچێت چەند وشەیەکی کەم هەن کە لەنوێژدا بەکاردێن، لەپێشەوە بانگ و قامەت دواتر الله أكبر، سبحان ربي العظيم، سبحان ربي الأعلیو سورەتی فاتحە و دوو سورەتی کورت هەن کە هەموویان لاپەڕەیەك پڕناکەنەوە. ئەو وشانە بەزۆریی هەموو کەسێك دەیانزانێت و کەوتوونەتە سەر زمانی هەموو موسوڵمانێك بە پلەیەکی وا کە منداڵ یاخود یەکێك کە تازە دەستیپێکردبێت، بێ ئەوەی لەماناکەی تێبگات و هەوڵێکی زۆر بدات فێردەبێت، ئەگەر یەکجار مانای ئەم وشانە فێرببێت ئیتر پێویست بە ڕەخنەگرتن ناکات. لەدواجاردا،

ئاوڕێك لـەو نووسـەرانە بدەینـەوە كـە بـە پاڵپشـتی فـەتوای إمـامی ئەعزەم (ئەبو حەنیفە) دەڵێت: ڕێگەدراوە كە لە نوێژدا ڕاڤەی قورئان بخوێنرێت.

– بۆچی ئەم نووسەرانە ڕاستییەكان بەتەواوی دەرنابڕن؟

ئیمامی ئەعزەم (ئەبو حەنیفـە) سـەرەڕای بـوونی ئـەم قەناعەتـەی لەسـەرەتادا، كەچـی بـەپێی زەمـەن بۆچـوونی گۆڕیـوە. لەپـەڕاوی (الهِدايةُ درُّ المـُختار)دا ئـەم بابەتـەیان ڕوونكردووەتـەوە و بەشـداریی ئیمامی ئەعزەمیان لەو فەتوایەدا ڕاگەیاندووە كـە دەڵێـت: لەحاڵـەتی ئاسـاییدا تـەنها خوێندنـەوەی دەقـی عـەرەبی ڕێگەپێـدراوە. بۆچوونەكانی (بديع الزمان سعيد نورسی)یش بەهەمان ئاڕاستەن.

پرسیارێكی تری محەمەد، دووبارە پەیوەندی بەو بابەتانەوە هەبوو كە ڕۆژانە زوو زوو پرسیاری دەربارە دەكرا. بۆیە وتی:

"مـادەم هـەموو شـتێك لەقورئانـدا هەیـە، كەواتـە چ پێویسـتیمان بەئیمامی مەزهەبەكان و زانایانی تری ئیسلامیی هەیە؟"

ئەم پرسیارە چـەندەها سـەدەیە هـەر دەكرێـت و پێویسـتیش بـوو بـەردەوام بێـت. هـەوڵی وەڵامدانـەوەی ئـەم پرسـیارەشمدا: هـەروەك چۆن لەكاتی تەماشاكردنی وێنە و شارەكانی نێو پەڕاوی گەردوون كە بـە پێنووسـی توانسـتیی خـوای مـەزن نووسـراوەتەوە، سەراسـیمە و تێنەگەیشتوو دەمێنینەوە، ئاواش لەكاتی خوێندنەوەی قورئاندا، یان سەرنجدان لە واتا پوختەكانیدا زۆركەم تێدەگەین. هـەروەك چۆن لـە

پەراوی گەردووندا زانا و داهێنەرەکان بوونیان هەیە تاوەکو لەئاڵۆزی و نادیارەکان بکۆڵنەوە، ئاواش بۆ ورد بوونەوە و لێکۆڵینەوەی قورئانی پیرۆز ئاتاجی زانا و موجتەهیدە بەڕێزەکانین.

لەکاتێکدا کەسێکی نەخوێندەوار و ڕەشۆك وا گومان دەبات کە خۆر بەقەدەر سێوێکە، ئەوا ئەستێرە ناسێك دەزانێت کە خۆر بەئەندازەی یەك ملیۆن جار لەزەوی ئێمە گەورەترە، لەم لاشەوە ئەو مرۆڤە نەزانەی وا دەزانێت خوێن ئاوێکی سوورە، بێئاگایە لەو پزیشکەی کە سەرگەرمی لێکۆڵینەوەی ئەو ملیۆنان خرۆکە سپی و سوورانەیە کە لەنێو خوێندایە.

کاتێك کەسێك سەیری ڕووبارێك دەکات، بێجگە لە ئاو هیچ شتێکی تر نابینێت، لەکاتێکدا کە ئەندازیارێکی کارەبا، دەتوانێت ئەو تەزووانە ببینێت کە لەپشتی ئەو ڕووبارەوە دەردەچن.

ئەوکاتەی کەسێکی بێئاگا لەزانستی ڕووەکناسی تەماشای ڕواڵەتی دەرەوەی ڕووەکێك دەکات، ئەو کەسەی کە لەو زانستەدا بەرەوپێش چووە، چەندەها گەنجینەی نهێنی لەو ڕووەکەدا دەخاتە ڕوو و ئەگەر دەرمانسازیش بێت، لەو ڕووەکانە دەرمان و چارەسەر دروست دەکات.

ئێستا ئەگەر کەسێك لەدەرمانخانە چارەسەر وەرنەگرێت و بڵێت: مادەم هەموو چارەسەرەکان لەڕووەکە هەمە جۆرەکانەوە بەدەست دێت، ئەوکات لەبری چارەسەر و دەرمان وەرگرتن لای دەرمانسازێك،

خـۆم لـە سەرچـاوەکەیانەوە سـوودمەند دەبم. ئـەوجا بچێتە کـەژ و کێوەکان و دەست بکات بەکۆکردنەوەی گـژوگیا و ڕووەك، ئـەوجا بـە خواردنیان چەند نابەجێیی و هەرزەییەك دەکات؟!

هەربۆیـە بـۆ تێگەیشـتن لەگـەورەیی و نـاوازەیی هـەر ئایـەتێکی پیرۆزی قورئان و دەرك کردنی ئـەو پلـە نوورییـە پرشـنگدار و پەیڤـە ناسکانەی کە لەئامێزی ئایەتەکاندا پەنامەکن، پێویسـتە بگەڕێینـەوە بۆلای تایبەتمەندانی ئەم بوارە و چارەسازان و ئەندازیارانی پسـپۆڕ و سوودمەندبین لەڕێژنەی بیر و هەڵێنجانیان، بـە پێچەوانەشـەوە ڕادەی ڕووکەشبوون و نەزانیمان لەنموونەکەی سەرەوە تێدەگەین.

محەمـەد بـۆ ماوەیـەك بێـدەنگ بـوو، هـەروەك بڵێیـت سـەرگەرمی بیرکردنەوە و هەڵسەنگاندنی ئەو وەڵامانە بێـت کـە گوێبیسـتی بیـوو. ئـەوجا بابەتەکـەی گـۆڕی و دەسـتیکرد بەهەنـدێك بابـەتی سیاسـی، منیش پێش چـوونە نێـو بابەتەکـە و بەمەبەسـتی داخسـتنی وتم: زۆر حەزم لەسیاسەت نییە و پەیوەندیم پێـوەی نییـە، ئـەوەی کـە زیـاتر پەیوەنـدی بەمنـەوە هەیـە پـەروەردەکردنی خـەڵکی، خـووڕەوشـت، هەڵسوکەوت و بونیاتی و بیروبـاوەڕە، ئـەو لایەنـەی کـە ئـەمڕۆ جێـی بایـەخ و پێویسـتی خەڵکییـە سیاسـەت نییـە، بـەڵکو حەقیقـەت و ڕاسـتگۆیی و لێبوردەییـە. ئەمـەش لەئـەنجامی تـرس لـەخوا و دەستگرتن بە بناغەکانی ئیمانەوە دێتەکایەوە، چونکە ئەگـەر مرۆڤ

ڕێك بێتەوە هەموو شتێك ڕێكدەبێت، ڕێكبوون و چاكسازی مرۆڤیش بەسیاسەت نا بەڵكو بەئیمان دەبێت.

محەمەد ئەم سەرەتایەی بەهەلزانی و پرسیارێكی تری كرد:

"باشە ئەگەر چاكسازی كۆمەڵگا و دەوڵەت بەندبێت بەچاكسازی كردنی مرۆڤەوە، ئایا ڕێگایەكی زۆر درێژخایەن نابێت؟ واتە مرۆڤ تا تەمەنی (٣٠) ساڵ ئینجا پێدەگات و پەروەردە وەردەگرێت و كامڵ دەبێت. ئایا دەبێت بە مەبەستی چاكسازی كردنی كۆمەڵگا (٣٠) ساڵ چاوەڕوانیی بكرێت؟ ئایا گۆڕینی ئاڕاستەكەرانی كۆمەڵگا (دەسەڵاتداران) و هێنانی كەسانی شیاوتر و ڕێگەیەكی كورتخایەنتر نییە؟"

محەمەد پرسیارێكی زۆرگرنگی پرسی:

زۆرێك لەوانەی لەپێناو خۆشگوزەرانی و ئاسوودەیی كۆمەڵگەدا دێنە مەیدان، لەئاكامی چەندەها ئەزموون و ڕێگای هەڵە و پەلەوە كۆمەڵگا دووچاری چەندەها كێشە و دژواریی دەكەن، كەچی هێشتا دەیانەوێت سیستەمی فەرمانڕەوایی لەڕێگەی سیاسەت و فشار و توندوتیژییەوە بگۆڕن ئەمەش دیدێكی زۆر مەترسیدار و زیانبەخشە.

هەوڵمدا وەڵامی ئەم پرسیارە بەتایبەتی بدەمەوە:

"بەداخەوە لەبەر پەرۆشی كەسانێك كە خاوەنی شێوازێكی كەم و كوڕن و، پڕوپاگەندەكردنی ئەوەی كە ئەمە ڕێگەیەكی درێژخایەنە، وای دەبینن كە چارەسەری لاشە تەنها لەگۆڕینی سەردایە. هەڵبەتە

کاتێك ئەم کەسانە دەڵێن با سەر بگۆڕین هاوکات لاشــە بــەرەو مــردن ڕاپێچ دەکەن. پەیوەندی نێــوان ســەر و لاشــە وەك پەیوەنــدی نێــوان کەسانی دەستەی بەڕێوەبردن و هەڵسوڕاندن لەگەڵ فەرمانبەران یــان هەڵسوڕێنەراندایە. ئەگەر لەســەردا هەڵەیــەك هــەبێت چارەســەرەکەی پلە بەندیی دەبێت، واتە بەگوێرەی مەرجــە سرووشــتییەکان، هــەنگاو بەهەنگاو.

لــــەم ســــەردەمەدا بــــەهۆی لاوازبــــوونی ئیمانــــەوە و لەئــــەنجامی تێنەگەیشتن لە دانایی ڕەهای ناوگەردوون، نەزانینی پەیوەندی نێــوان قەدەر و جوزئی ئیختیاری و لەبەر چەندەها هۆی تریش گەلێك پەتای بێ بڕوایی لە کۆمەڵگەدا بەدیارکەوتوون، لەکاتی بەدەرکەوتنی ئەدگار و ڕواڵەتەکانی ئەو جۆرە پەتا و نەخۆشییانەدا. ئــەوەی کــە پێویســتە بکرێــت لــەبری پەلــەکردن و هێرشــکردنە ســەر هەڵســوکەوتەکانی ئــەو مرۆڤە، دەبێــت هــەوڵی دۆزینــەوەی نەخۆشــییەکە بــدرێت، ڕاوەســتان لەســەر ئــەو تایبەتمەندییانــەی کــە چارەســەری دەکــەن، کەسێك کــە بــاوەڕی لاواز و خــراپ بووبێــت و بــە ڕەفتارەکــانی زیــان لــەخۆی و کۆمەڵگە بدات، هێرش بردن، پــەلاماردانی، لێــدانی، زینــدانی کــردن و تەنانەت کوشتنی، شێوازی گونجــاونین بــۆ گــۆڕینی ئــەو کەســە. ئــەو مرۆڤەی کە ڕێگەی سزێژی چاکسازیی گرتبێتەبەر، پێویستە بە ئارام و خۆگربێت. کاتێك مرۆڤەکان چاککران، کۆمەڵگا و دەوڵەت و ئەوانــەش

که بەڕێوەی دەبەن باش دەبن، ئەم ڕێگە درێژەش پێویستی بە دان بەخۆداگرتن و چاودێریکردن هەیە.

بە لێدان و، سووتان و فێڵ و تەڵەکەی سیاسیی، مرۆڤ و کۆمەڵگا ڕێك ناکرێنەوە، بگرە کێشەکان ئاڵۆزتر دەبن.

سەرەتای هەموو شتێك مرۆڤ و قەتارکردنی ئەم کائینەیە لە لایەنە نێگەتیڤ و بۆچوونە زیانبەخشەکان و یاد خستنەوەی کە ئەو کێیە؟ لە کوێوە هاتووە؟ بۆکوێ دەڕوات؟ مەبەست لە هاتنی چییە؟ دیارە ئەمەش تەنها بە باوەڕ بەخوا و دوارۆژ سازدەبێت. کات تابڵێیت درەنگ بوو بوو..

## وەڵامەکان زۆر کاریگەرن

بۆ جارێکی تر خانمی ماڵەوە قاوەی بۆ هێناین وخۆی خستە نێو باسەکەوە:

"قسەکانتان زۆر خۆشن، بەڵام میوانەکەمانت زۆر ماندووکرد. ئەوەندەی نەماوە بانگی بەیانی بدات، تۆزێك پشوو بدەن و دوایش دووبارە لەکاتی گونجاودا بەردەوام بن".

ڕاستەوخۆ سەیری محەمەدم کرد بزانم بەرامبەر بەم قسانە کاردانەوەی چۆن دەبێت.

محەمەد بەبێ وەستان وەڵامی دایەوە:

"نا نا، ئامۆژن: من هیچ ماندوو شتی وا نیم، ئەگەر دەخوازیت بزانیت ئەم گفتوگۆیە بۆمن چەند بە بایەخە، ئەوا پێویستە

گوێبیستی زایەڵەی نێو دەروونم بیت، ئەو بابەتانەی کە لەژیانمدا زۆر مەبەستم بوون و ترساوم لە قسەکردن و پرسیارکردن دەربارەیان، ئەمشەو کرانەوە، ئەمشەو یان دەستپێکی ژیانم یان کۆتاییەکەی دەبێت. نازانم لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دێم. ئێستا تامەزرۆی ئەوەم بزانم ئەم ڕێگەیە سەر لەکوێوە دەرئەکات؟"

لەڕاستیدا پرسیاری زۆر زۆرم کرد و وەڵامی زۆر کاریگەریشم دەست کەوت.

هێشتا ئەمانەم شی نەکردووەتەوە و بەشێوەیەکی زۆر چاك، نەم نرخاندوون و هەرسم نەکردوون، بابەتی بەنرخ وگرنگی ئاوها، ئەوجا بەچەند هەفتەیەك هەرس دەکرێت و دەگەم بەئەنجامێك، پێویستم بەکات هەیە بۆ بیرکردنەوە.

ئەم سەلماندنانە زۆرگرنگ بوون. ڕادەی تێگەیشتن و زیرەکیی و بیرتیژیی محەمەدیش زۆر ناوازە و لەڕادە بەدەربوو. کە وەڵامەکان دەدرانەوە، هەر لەسەرەتاوە تێدەگەیشت ئەنجامەکەی بەرەو کوێ دەڕوات، ئەمەش زەمینەیەکی گونجاوی گفتوگۆی دەڕەخساند.

دوای خواردنەوەی قاوەکەمان، بەردەوامبوو لەسەر پرسیارکردن بۆ وەڵامی پرسیارەکانیش بەزۆری کتێبەکانی پەیامەکانی نوورمان دەکردەوە و دەمان خوێندەوە. زۆر کاری تێکرد. بەتایبەتیش بەرامبەر ڕوونکردنەوەکانی کتێبی پەیامەکانی نوور زوو زوو دەیوت:

(بۆچی ئەم کتێبانە بۆ خەڵکی باس ناکرێن، لە قوتابخانەکاندا وەکو وانەیەك دانانرێت) بەم قسانە پەرۆشی خۆی دەردەبڕی.

ئەمشەو زۆرشت باسکرا، بەڵام شتی زۆر گرنگ بوون، جا پرسیاری چی نەکرد؟ بۆچی مەلائیکەت نابینین؟ حەزرەتی عیسا بۆچی بێ باوك لەدایك بووە؟ بۆچی وڵاتە ئیسلامییەکان دواکەوتوون و مەسیحییە ڕۆژئاواییەکان پێشکەوتوون؟ ئایا دین پێچەوانەی زانستە؟ ئایا ژیان کۆمەکی و هاوکارییە یان زۆران و مانەوەی بەهێزە؟ ئایا ڕۆحی کەسی مردوو دووبارە لەنێو جەستەی یەکێکی تردا دێتەوە؟ ژیانی قەبر و دوارۆژ چییە؟ وەك ئەم جۆرە پرسیارانە و جۆرەها پرسیاری تر...

بەپێی توانا بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکان محەمەد بەخوێندنەوە و سوود وەرگرتن لەپەیامەکانی نوور بەشێوەیەکی سەرەکی و زۆرێك لەسەرچاوەکانی تر بابەتەکانمان دەوڵەمەند دەکرد.

لەمیانەی ئەم گفتوگۆیەدا ڕوویەکی جیاوازی محەمەدم دۆزییەوە.

پرسیارەکانی محەمەد بۆدڵ ئازاردان و خۆنواندن و بێزاکردنی بەرامبەر نەبوون، بەڵکو بەهیوا و ئامانجی فێربوون و زانین دەیپرسین و ئەمەش کەشێکی زۆر پڕکەیف و خۆش و شیرینی دروست دەکرد.

هەرکاتێکیش دڵنیا نەبوایە لەوەڵامی پرسیارێك بەبێ دوودڵی دەیوت:

- مامۆستا ئەم وەڵامە بۆمن بەس نییە و، عەودالّیی خۆی بەدوی ڕاستیدا دەسەلماند.

لە کۆتایی قسەکاندا، موحەممەد بۆماوەیەك قاڵی ئەمدیو و ئەودیوکردنی پەڕاوی پەیامەکانی نووربوو کە لەسەر مێزەکە دانرابوون. لەناکاو وەرگەڕایەوە و پرسیاریکرد و وتی:

- ئایا کتێبەکانی پەیامی نوور بەزۆری باسی بابەتە ئیمانییەکان دەکەن؟

منیش بەشۆخییەوە وتم: "ئیدی وەڵامی ئەم پرسیارەت نادەمەوە."

- لەبەر چی؟

- بیخوێنەرەوە و خۆت وەڵامەکەی بدۆزەرەوە.

وتی:

باشە مامۆستا بەڕاستی دەیخوێنمەوە و لەڕاستیشدا لەئێستاوە زۆر زۆر تامەزرۆم بۆ خوێندنەوەیان.

دوو کتێبم پێدا تا بیانخوێنێتەوە یەکێکیان، کتێبی مامۆستا سەعید نوورسی بەناوی (عەصای موسا) بوو و ئەویتریشیان بەناوی (ئەو پیاوەی لە دووی خۆی دەگەڕێت). پێم وت: ئەمانە بخوێنەرەوە دووبارە دەست دەکەینەوە بەقسەکردن.

محەمەد بە زەردەخەنەیەکی شیرینی سەر لێوانی ڕوویکردە من و وتی: مامۆستا دەمەوێت کە بڕوام پێ بکەیت ئەمشەو بەتامترین و

خۆشترین و پڕماناترین شەوە کە تێیدا ژیابم. ئەمە بەشێکی تایبەتی دروستکرد لەژیانمدا بەلایەنی کەمەوە توانیم بوونی دونیای جیاوازیش ببینم. یەکەم جاریشمە تێبینی ئەوە دەکەم کە کەسانی خێزانێك ئەمەندە ئاسوودەبن و خۆشییەکی شاراوە و ئەفسوناوییان دروست کردبێت.

ئەو پشووی هەفتەیەمان بەم جۆرە وتووێژانە بەڕێکرد. محەمەد دەیوت خۆشترین کاتییەتی و هەرگیز لەیادی ناکات، لەڕاستیدا بۆ منیش ساتانێك بوون کە یادکردنیان ئەستەم بوو. بەم هۆیەوە جارێکیتر لە ئاوێنەی زیهنمدا ئەو ڕستەیە خۆی نواندەوە کە: ((قوتارکردنی گەنجان لە نسکۆ و گرفتەکان، هەروا بۆ دەستەبەرکردنی ژیانێکی کامەران بۆ کۆمەڵگا و بەرەڤانی کردنی دەوڵەت لە شپرزەیی و ئاژاوەگێڕی، پێویستە جارێکی دی و سەرلەنوێ چاو بخشێنینەوە بە سیستەمی پەروەردەی پەیڕەوکراو لەنێو نێوەندەکانی خوێندندا. گرنگترین پەروەردە و ڕێگەچارە کە پێویستە پێشکەشی لاوێکی گرفتار یا خوێندکارێکی گیرۆدە بکرێت، تێگەیاندنی ئامانجی مرۆڤە، ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە بۆچی دەژی و ڕۆژێك دێت کە ڕووبەڕووی لێپرسینەوە دەبێت)). ئەگەر ئەمە بکرێت زۆرێك لە کێشەکانی گەنج و کۆمەڵ چارەسەر دەکرێت. لەبەر ئەوەی کەسێکی بێبڕوا نازانێت لەبەرچی دەژی و بڕوای بەهیچ لێپرسینەوەیەك نییە و، هیچ لەمپەرێك نییەکە ڕێگەی بگرێت

لەئەنجام نەدانی خراپە، زیان نەگەیاندنی، لەکێ بترسێت و شەرم لەکێ بکات و، کێیە سیستەمی کۆنترۆڵی ڕێکوپێکی پێدەدات، واتە مرۆڤ چۆن سیستەمی خود کۆنترۆڵی دەخاتە بزاوت؟

بێجگە لەخواترسان و بڕواکردن بەلێپرسینەوەیەك لەو کردانەی کە دەیانکات، چی هەیە کە بتوانێت دڵنیایی دەستەبەر بکات؟

ئەو شەوە ئەم پرسیارانە و هاوشێوەکانی بەتەواوی مێشکیان سەرقاڵکردبووم، لەکاتی گەڕانەوەماندا بۆ زانکۆ لەگەڵ میوانی کۆتایی هەفتەم (محەمەد)دا، دەمانزانی کە بابەت گەلێکی زۆر چاوەڕوانمانن و خوازیاری تاوتوێ کردنن.

## محەمەد زۆر بەخێرایی دەگۆڕدرا

هەفتەیەك بەسەر گفتوگۆ درێژەکەی من و محەمەددا تێپەڕی، لەناخمدا ئاوێتەیەکی ئومێد و پەرۆشیی هەبوون، چاوەڕوانی پێشهاتی دیار و هەواڵی خۆشم لە محەمەددا دەکرد. لەماوەی ئەم هەفتەیەدا، چەند جارێك چاومان بەیەکتری کەوت دەستی یەکترمان دەگوشی و بەسەر پێییەوە هەواڵم دەپرسی. ئەو محەمەدەی کە بەکەسایەتییەکی خۆتێهەڵقورتێن و بێ پەروا ناسرابوو و ئەوەی بەدڵیدا بهاتایە دەیوت، ئێستاکە هێوربووەتەوە، سەراپا لەنێو جیهانی خامۆشیدا گوزەر دەکات و چووەتە بارێکی نامۆوە.

ئەم دۆخەی محەمەد تووشی پەژارەی کردم، لەکاتێکدا چاوەڕوانی هەواڵی خۆش و پڕ ئومێدم لێدەکرد، کەچی ئەو کەوتبووە نێو

گێژاوێکی دەروونی و کەشێکی تەماوییەوە، هەربۆیە ئەم حاڵەتە منی زۆر نیگەران کردبوو.

لەبەرئەوەی کە محەمەد بەتەنها لەماڵێکدا دەمایەوە شانسی پرسیارکردنی ئەوەم نەبوو کەبزانم چی دەکات و بانگهێشتکردنی و پرسینی حاڵ و باریشیم بەزیادەڕۆیی و ڕووگیری دەبینی.

لەو ڕۆژانەدا چووم بۆلای بەقاڵێك بۆ سەوزەکڕین، بەقاڵەکە دۆستێکی ناسراو بوو. محەمەدیش کرێچی بەقاڵەکە بوو، خەریك بووم پرسیاری محەمەدی لێ بکەم، بەقاڵەکە دەستی پێشخست و وتی: مامۆستا ئەو قوتابییەی تۆ، چی بەسەرهاتووە لەم ڕۆژانەدا؟ منیش بەنیگەرانییەوە وتم:

(خێرە)؟ وتی: وەڵلاهی ئەم گەنجە شتێکی بەسەرهاتووە. لەوەوپێش بەقرەقر و هەراوهوریا وەختبوو ئەم بینایە بڕوخێنێت کە تێیدا دەژین، کەچی ئەمە چەند ڕۆژێکە بێ دەنگ و خامۆش بووە هەتاکو بەرەبەیان گلۆپەکانی دەسوتێن لەوە دەچێت کارێکی بێدەنگ و بێسەدا ئەنجام بدات.

- ئۆخەی ئاسودەبووم، إن شاء الله هەموو شتێك وەك ئەوەی ئومێد دەکەم دەبێت. شتێك لەئارادا هەیە، منیش هەستم بەمە دەکرد و لەناخمدا بەبێ هیچ لێکدانەوەیەك ڕۆیشتم و دەروونیشم لەئاسودەییدا خرۆشابوو. ئاشکرایە کە گۆڕانکاری زۆرگرنگ لە

محەمەدا بووە بەڵام دووبارە لەچ لایەنێکەوە بووە، ناخمی هەژاندبوو، ئیتر هەموو ئەندێشە و چاوەڕوانییەکانم گرێدرابوون بەم حاڵەتەوە.

محەمەد دووبارە دەستیکردەوە بەسەردانم، پرسیار و لێکۆڵینەوەی ئەو باسانەی کە ماخۆلانی بوون وعەودالّییەکانی هەر بەخێرایی بەردەوام بوون، هێشتا شتانێکی زۆر مابوون کە بۆئەو نهێنی و نەزانراو بوون.

تێگەیشتم کە لەگەڵ محەمەددا پەلەم کردووە، محەمەد جیهانێکی زۆر فراوانی هەبوو پێویست بوو کە بەسەنگینی و تێگەیشتنی تەواوەوە گوزەری بکردایە. ئەم کتێبانەی کە پێم دەدا دەیخوێندنەوە و ئەگەر پرسیارێك لەمێشکیدا دروست ببوایە و ببوایەتە ماخۆلانی قسەمان لەسەری دەکرد.

بەخێرایی لەگۆڕاندابوو، هەڵسوکەوتەکانی، هەڵوێستەکانی، بیروبۆچوونەکانی و، لێکدانەوەکانی لەوپەڕی ناوازەییدابوون، زیرەك بوو زۆر بەخێرایی تێدەگەیشت، گرنگترین ڕووداوەکان وحاڵە دیارەکانی زۆر بەئاسانی وەردەگرت و وازی لەهاوڕێ بێسەروبەرەکانی گروپەکەی هێنابوو. ئیتر لەدونیای خۆیدا سەرقاڵی نەهێشتنی گێژاوی ناخی خۆی و ڕۆشنکردنەوەی دونیا لێڵەکەی و داڕشتنی سیستەمێکی تازە بوو بۆ ژیانی. ئەم هەوڵ و تەقەلا نەپساوانەی محەمەد هەشت مانگی تەواوی خایاند.

# ئیتر چاوەڕێی مژدەیەکم لێدەکرد

ئەو، خاوەن بونیادێکی لێکۆڵەر و، پرسیارکەر و، عەودالّ بوو و زۆر بە وردیی و بوێرانە گەشەی دەکرد.

لەم ماوەیەدا، بە سەدان جار پێکەوە بووین و قسەمان کردووە، چەندجاریش لەتەك یەك بەیانیانمان کردووەتەوە.

ئیتر چاوەڕێی مژدەیەکم لێدەکرد، بەڵام ئەم مژدەیە بەهیچ شێوەیەك نەدەهات.

پێش ئەوەی بۆ پشووی هاوین بگەڕێتەوە بۆشاری خۆیان ئێوارەیەك تەلەفونی بۆکردم.

وتی: مامۆستا، بەیانی کاتێکم بۆ دیاری بکە پێویستە لەگەڵ ئێوە قسەبکەم.

پێکەوە لەژوورەکەمدا بەیەك شادبووین. لەبەرامبەرمدا دانیشت. لەسەریەوە تا خواریەوە لێی وردبوومەوە، چەندە گۆڕرابوو، ئەو محەمەدەی کە لەشوێنی خۆیدا نەدەوەستا بێشەرم و پەرشوبڵاو وێژ بوو، ڕۆیشتووە و لەشوێنیدا مرۆڤێکی کامڵ و بەڕێز و سەنگین هاتووە.

لەناخمدا دەموت: (ئەی خوایە، ڕێنمویی ئەم گەنجە بکەیت، ئەم گەنجە بەتوانا و زۆر زیرەکە لەدەست نەچێت، ئەگەر لەهەندێك ڕاستی تێ نەگەیشتایە بەحاڵێکی زۆر پەرێشانەوە دەچووە ناو کۆمەڵگاوە و دەبووە درم و پەتا بۆ جڤاتەکەی.)

ماوەیەك سەیری یەكترمانكرد لە ڕووخساریدا دەربڕینێكی ئارام و نەرم و بەفرمێسك بەدەركەوت. لەبریسكەی چاوەكانیدا دیاربوو كە لەئاسمانی دەروونیدا هەندێك هەوری سۆز و نەست و دڵتەنگی یارییان دەكرد بەدەنگێكی گڕ و پڕ هەنسكەوە وتی:

(مامۆستا دەستمكرد بەنوێژكردن و لەسەر بەرماڵەكەم چەندەها سەعات گریام. هێزێك منی بەرەو لای خۆی ڕاكێشا، هەروەك بڵێیت ئێش و ئازارو ناڕەحەتییەكانی ناخم بەگریان ڕژاند)

هەم قسەی دەكرد و هەم لەچاوە هەورینە ئەسرین ئامێزەكانییەوە بەخوڕ فرمێسك دادەباری، ناخی منیش دەستی بەخرۆشان كرد. زۆرم لەخۆم كرد تا نەگریم.

(مامۆستا ئەم نوێژە چەند پەرستشێكی شیرین و بەلەزەت و بڵندە، وەستانت بەرامبەر بەخوای گەورە، پێشكەشكردنی داواكارییەكانت بەو زاتە مەزنە، باسكردنی حاڵی خۆت، پاڕانەوە و داوای لێخۆشبوون كردن، چەندە مرۆڤ ئاسوودە دەكات، چەندیش دەگات بەئاسوودەیی).

ئیدی پەیمانم داوە بەخوای گەورە، دوای ئەمە ببمە بەندەیەكی شیاوی ئەو. بەڵام من هێندە سەرپێچی و تاوانم كردووە، ئایا خوای گەورە لە تاوانەكانم دەبوورێت؟

ڕستەی كۆتای زۆر بەناڕەحەتی تەواو كرد، هەر دەگریا و هەنیسكی دەدا، ئاخر كێ دەتوانێت خۆی بگرێت؟ گریانی ئەو گەنجە

بێ ڕێسا پەروازەیە، وەك منداڵێكی بێتاوان ناخمی سوتاند، بۆئـەوەی فرمێسكی چاوەكانم نیشان نەدەم هەتا دەمتوانی خۆمم دەگرت.

تۆ چەندە گەورەیت ئەی خوای گەورە؟

كە خۆت هیدایەتت كردە نسیبـی كەسـێك، كـێ هەیـە لەبەردەمتـدا چـۆك دانـەدات؟ كـێ هەیـە كـە نەچـێتە سـوجدە و داوای لێبـوردن نەكات؟ پەروەردگارا ژمارەی ئەمانە زیادبكە.

كێ دەیوت كە محەمەد دوزجەیی وازدەهێنێت لەو داستانە پووچانە و دەسـتدەكات بەنوێـژ، بۆئـەوەی ببێتـە بەندەیـەكی تـەواو، پـەیمان دەدات بەخوای گەورە و فرمێسك دەڕێژێت؟

هـەوڵی دڵدانـەوەی ئـەو محەمـەدەم دا كـە لەبەرامبەرمـدا نـوقمی هەنسكی گریـان ببـوو، باسمكرد كـە خـوای گـەورە چـەندە خـاوەنی لێبووردەییـەوە چـەندەش حـەزدەكات كـە بەنـدەكانی ببەخشـێت باوەشم پێداكرد و ماچمكرد و پیرۆزباییم لێكرد.

ئەوكەسانەی كە ڕەوشـتی یەكـەمجاری محەمـەدیان دیبـوو هـەرگیز بڕوایان نەدەكرد. دەیانوت: "ئەو دیسان ڕۆڵێك دەبینێتەوە و ڕاستگۆ نییە لەبڕیارەكەیدا" و تێدەپەڕین، بـەڵێ ئـەو ڕۆڵێكـی دەبـینی بـەڵام ئـەم جارەیـان ڕۆڵـی بەندایـەتی ڕاسـتەقینە. ئـەم ڕۆڵـەی ئەوەنـدە پەسـەندكردبوو هـەروەك بڵێیـت هـەموو كـونج و لایـەنێكی پـەخش كردبێت، ئەم ڕۆڵە زۆر لە محەمەد دوزجەیی دەهات.

محەمەد کە چووەوە بۆ دوزجە و بەخێزانەکەی شادبووەوە، دایك و باوکی لەتاوا جەژنیان گێڕا.

خێزانەکەی محەمەد، ڕەوەندی بولگاریی بوون. ئەو گوشار و فشارە لەڕادەبەدەرەی کە بولگارستان لە ساڵی (١٩٨٩) بۆ گۆڕینی زمان و دینی موسوڵمانە تورکەکان بەکاریهێنا، ئەوانیش یەکێك بوون لەو هەزاران خێزانانەی کە پەنایان بردە بەر تورکیا.

سەرۆکی خێزان (مامە صالح)، هاوسەرەکەی (پورە بەیزا) لەگەڵ سێ منداڵەکەیان لەسنوورێکی نزیکی تورکیا و لەشوێنێکی بچووکی (کرجەئالی) ناسراودا نیشتەجێ بوون. بوونە پەنابەر لە تورکیا.

محەمەد لە ساڵی (١٩٧٨) لە کرجەئالی لە دایك بووە، کاتێك کە هاتەوە بۆ تورکیا تەمەنی یانزە ساڵ بووە، ئەم خێزانە ماوەیەك لە (چۆرلۆ) و (ئەستەنبوڵدا) مانەوە و خەریکی بازرگانی هەنگوین بوون و لەم بازرگانییەشدا سەرکەوتوو بوون.

بەم شێوەیەش ئاستی ئابووریان تاڕادەیەك باشبوو هەر لەساڵی (١٩٩٦) وە دەستیان کرد بەوەی کە هاوینان لە دوزجە و زستانانیش لە چۆرلۆ بژین. خێزانێکی زۆر تێکۆشەر و میوان پەروەربوون.

مام صالحی باوکی بە نووسینی نامەیەکی دوورودرێژی بۆ من باسی ئەو خۆشییەی کرد کە خێزانەکەیان بەبیستنی هەواڵی محەمەد تیایدا دەژین. لەو نامە پڕ لەشادی وجۆشمەند و تەڕەدا (فرمێسك ئامێز) دەیوت: (چیمان نەکرد بۆ ئەوەی محەمەد بێتە سەر ڕێگەی ڕاست،

ئای چ ڕووداو گەلێك ژیان لەگەڵ ئەو منداڵەدا. بەهۆی ئەوەوە نەخۆی و نە ئێمەش ڕزگارمان نەبوو لەو بەڵایانەی کە بەسەرماندا هاتن).

لەڕاستیدا بڕوامـان نـەکرد کاتێـك بینیمـان محەمـەد گەڕاوەتـەوە و دەستیکردووە بە نوێژکردن، وامانزانی گاڵتەمان لەگەڵ دەکات، کاتێك کە تێگەیشـتین گاڵتـە نییـە و ڕاستە، لەگـەڵ دایکیـدا چـەندە پێمـان خۆش بوو، نـاتوانم تێتـان بگەیـەنم. هـەموو دونیـا بووبـە هـی ئێمـە. بڕوابکە چەند ڕۆژێك هەر فرمێسکی شادیمان دەڕشـت. خـوای گـەورە ئەم ڕۆژانەشی پیشانی ئێمەدا.

ئێسـتا خۆشـبەختی و ئاسـوودەیی بووەتـە میـوانی ئـازیزی مـاڵی ئێمـە، هـەموو ئەنـدامانی خێزانەکـە پێکـەوە نوێـژەکانمان بەکۆمـەڵ دەکەین. خۆشی شەو بۆ شەونوێژ هەڵدەستێت و بـەفرەیی تەفسـیری قورئان دەخوێنێتەوە.

هەموو ئێوارەیـەك خوشـك و براکـانی کـۆ دەکاتـەوە و پەیامـەکانی نووریـان بۆبـاس دەکـات. ئـەی خـودای گـەورە ئـەم خۆشـییەمان بەردەوام بکەیت. جۆش وخـڕۆش و فرمێسـکی چـاوەکانی بـاوکی کـە دەڕژانە ناخمەوە زۆریان خرۆشـاندم، بـۆ بـەردەوامیی و سـەرکەوتنی محەمەد لەم ڕێگە ئیمانییەدا زۆر لەخوای گەورە پاڕامەوە.

ئەوانـــەی کـــە مامۆســـتانین لـــەم هەســـتە تێناگـــەن وەك چـــۆن قوتابییەکی هار و زیانبەخش مامۆستا دەڕەنجێنێت، بەهەمان شـێوە سەرکەوتنیشی، بەتایبـەت قوتابییـەکی وەك محەمـەد کـە سـەرلەنوێ

هاتووەتەوە ژیان و تەمەنی نۆژەنکردووەتەوە هێندەی منداڵی خۆی خۆشحاڵ و کامەرانی دەکات.

## کارەساتی بەسەرهاتووی محەمەد و میوانێکی ڕازئامێز

لە پشووی هاویندا، کاتێك محەمەد لە دوزجەوە بەرەو ئەنقەرە دەهاتەوە لەنزیکی ئەنقەرەدا کارەساتێکی بەسەردا دێت، بەشێك لە سەرنشینانی ئۆتۆمبیلەکە دەمرن و، بەشێکی زۆریشیان بریندار دەبن کە محەمەدیشیان لەنێودایە، بەبرینێکی سەختەوە دەهێنرێت بۆ نەخۆشخانەی (نموونە) لەئەنقەرە.

ئیدی ئەو ڕووداوە (پەند ئامێزەی) کە بووە خاڵی وەرچەرخان لەژیانی محەمەددا لەم نەخۆشخانەیەدا ڕوودەدات.

لەڕاستیدا ڕووداوێکی زۆر مانابەخش و هەست بزوێنە. محەمەد لەنەخۆشخانەدا (دە) ڕۆژ لەبێهۆشیدا دەمێنێتەوە، دواتر هەستی دەکرێتەوە و دێتەوە سەرخۆی، بەڵام ناتوانێت چاوەکانی هەڵبهێنێت، هەروەها توانای قسەکردنیشی نەماوە بەهۆی ئەو پێکانەی کە لەمێشکی دابوو. چاوەکانی کوێر دەبێت و توانستی قسەکردنیشی لەدەست دەدات، واتە محەمەد دووبارە دێتەوە دونیا بەڵام بێچاو و بێ زمان. ئەمە کارەساتێکی زۆر سەخت و دژوارە و هەمووان دەهەژێنێت.

بەڕاستی لەدەستدانی توانای بینایی و قسەکردنی مرۆڤێك بەو گەنجییە، کارەساتێکی جەرگ بڕو ناسۆرێکی تاڵە.

بەڵام محەمەد لەبەرئەوەی کە وشیارە و هەستی کاردەکات ئەم حاڵەتە ناکاتە دەرد بۆ خۆی، هەمیشە بەئامازە هەوڵی دڵخۆشکردنی دەوروبەرەکەی دەدات.

بەرامبەر بەو زاتە کە هەر خۆی هەموو شتەکان دەبەخشێت. دەبینێت و بیسەرە بەهەموو شتێك، محەمەد لەوپەڕی سوپاسگوزاریی و ڕەزامەندیی و ملکەچیدا بوو. چونکە بەخشەر هەرئەوە و سێنەریش هەرخۆی.

لەش ساغیش ئەو دەیدات، نەخۆشیش هەر ئەو... لەهەر پێشهاتێکدا بێگومان داناییەکی گەورە و خێرێکی فراوان هەیە پێویستە بەئارامییەوە چاوەڕوانی کۆتاییەکەی بکرێت.

محەمەد هەستی بە ئاگاوەیە بەڵام چاوەکانی بەشێوەیەکی داخراو، هەمیشە دوعای دەکرد و لەخوا دەپاڕایەوە، داوای لێخۆشبوونی دەکردو سوپاسگوزاریی دەردەبڕی، لەدوای ماوەیەك بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر چاوەکانی و زمانی دەکرێتەوە ئیتر ڕووداوەکانی ئەو شەوە ڕوودەدات. . واتە شەوی جومعە. .

ئەو شەوە بەدەم بیرکردنەوەیەکی مەزن و سوپاسگوزارییەکی زۆرەوە نوست، بیری لەمەزنی پەروەردگار و فراوانی میهری و فەزیلەتی بەندەگی و ئیمان و ڕۆژی قیامەت و پاداشتدانەوە دەکردەوە، لەبەر کەمتەرخەمی و نوقسانی و گوناهەکانی ڕابردووی پەنای بردبووە بەر ڕەحمەتی خواو بەفرمێسکەکانی داوای

لێخۆشبوونی دەکرد. لەحاڵەتێکی وەهادا کە وەك خۆی خستبێتە ئامێزی دونیایەکی مەعنەوییەوە، بە ئیخلاس و هەستی بەرزەوە چەندەها سەعات هەر دەگریا و دەپاڕایەوە و پاشتر لەهۆش خۆی دەچوو.

لەکاتێکدا کە لەژوورەکەیدا بەتەنها، کارەباکەی بەکزی دەسووتا، بێدەنگی هەموو ژوورەکان و سالۆنەکەی داپۆشیبوو، دەرگا کرایەوە و یەکێکی نوورانی و پرشنگدار کە کراسێکی پزیشکی لەبەردابوو هاتە ژوورەوە و وتی:

(خۆت کۆبکەرەوە، ئێستا میوانێکی زۆرگرنگ دێت، لەگەڵتا قسە دەکات، خۆت کۆبکەرەوە و پێشوازیی لێبکە)

محەمەد لەو شوێنەی کە لێی پاڵکەوتبوو بەپەرۆشەوە خۆی کۆکردەوە و زۆری پێ نەچوو، دووبارە دەرگاکە کرایەوە و میوانی چاوەڕوانکراو هاتە ژوورەوە، زاتێکی جبە و مێزەر لەبەری زۆر جدی هات و لەلای محەمەد دانیشت، دەستیگرت و دەستی بەسەریدا هێنا دەیوت: (براکەم پیرۆزبایت لێدەکەم، ئەم کارەساتە بووە کەفارەتی گوناهەکانی تۆ. ئەگەر خوا ئیرادەی شتێك بکات بێگومان خێرێکی تێدایە).

تۆ لەمردن گەڕایتەوە، من پێغەمبەر ﷺ بۆلای تۆی ناردووم من تۆم بەقوتابی خۆم قبووڵکرد. هەموو تاوانەکانی تۆم گرتە ئەستۆی خۆم مەترسە هێشتا تەمەنت ماوە بەڵام زۆر کورتە. دڵسۆزیی تۆ و

پاكییەكەت بووە هۆی بەدەستهێنانی شەفاعەتی پێغەمبەرﷺ ئەو قسانەی كە پێتدەڵێم لەبیرت نەچێت، بەهەمان شێوە جێبەجێی بكە، ئەگەر ئەمانە بكەیت مەترسە و ڕزگارت دەبێت).

كە محەمەد ئەو قسانەی بیست لە سەرسوڕمان و پەشۆكاندا خەریك بوو دڵی بوەستێت، ئەوەندەی ئارەقكرد گیانی خووسابوو، محەمەد لەبەرامبەر ئەو زاتە بەڕێز و وتە گرنگانەوە بەپەرۆشییەوە پرسی:

بەڕێز ئیوە كێن؟

من بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسیم، زاتەكەی پاڵیشم زوبەیری قوتابیمە تۆشم بەقوتابی خۆم قبووڵكردووە.

محەمەد بەپەرۆشەوە هەڵیدایە و وتی:

بەڕێزم من لەسایەی نوسینەكانی تۆوە ڕزگارم بوو، یارمەتیم بدەن مادەم تەمەنم كورتە، چۆن سوود لەم كاتە وەربگرم؟ ئەویش ئەم وەڵامەی دایەوە: نوێژە فەرزەكان و ڕۆژووە قەزاكانت تەواو بكە، پەرستشەكانت دوامەخە، هەموو ڕۆژێك جوزئێك قورئان و دوعای جەوشەن و (٥٠) پەڕە لەپەیامەكانی نوور بخوێنەرەوە، ئەگەر وابكەیت ئەوا لە سەرجەم ئەو خێرانە بەشدار دەبیت كە لەزەمانی حەزرەتی ئادەمەوە تاقیامەت دەكرێن، دەی بەخوات دەسپێرم.

دەرگاكە دادەخرێت و محەمەد وەك بیەوێت خۆی بگەیەنێتە لای ئەو زاتە و پێیان بگاتەوە، لەشوێنەكەی خۆی بەردەداتەوە زەوی.

محەمەد بەرامبەر بەم میهر و ڕێزلێنانە سەری دەخاتە سەر زەوی و چەندەها سەعات دەگری و سوپاسی خوا دەکات. لەدوای ئـەوەی کـە محەمـەد لەنەخۆشـخانە هاتـە دەرەوە ئـەم ڕووداوەم بیسـت. کاتێـك باسی ڕووداوەکەی دەکرد، هەم خۆی بەردەوام بۆ چـەندەها کاتـژمێر دەگریا و هەم منیشی خستە گریان.

بەڕاستی ڕووداوێکی سەیر و پەند ئامێزبوو.

## محەمەد دوزجەیی بوو بەکەسێکی جیاواز

ئەو کارەساتانەی کە بەسەر محەمەد دوزجەییدا هات، ژیانی ئـەوی گۆڕی. وەك بڵێیت ئەو محەمەدەی کە لەشوێنی خۆیـدا نەدەوەسـتا و چووست و جەربەزە و بێ ترس ڕۆیشت. لە شوێنیدا محەمـەدێکی زۆر جیاواز هاتووە. کە لەدونیا دابـڕاوە، دەسـتیکردووە بـە بەسـەربردنی ژیانێکی پەری ئاسا. هـەموو ڕۆژەکـەی بەپەرسـتش و تەوبـە و داوای لێبوردن کردن بەسەردەبرد، ئەوانـەی کـە ئاگـاداری ژیـانی ڕابـردووی محەمەد بوون بڕوایان بەمە نەدەکرد.

ڕوانـین و ڕوخسـار و قسـەکردن و هەڵسـوکەوتی و هـەموو حـاڵێکی وانەیەکی دەبەخشی.

وەك بڵێیت بەهەموو شێوەیەك بۆ ئـەو مردنـە نزیکـە خـۆی ئامـادە دەکـرد. بێزاردەبـوو لەکەسـانی دەوروبـەری و ناڕەحـەت دەبـوو لـەو هەڵسوکەوتە بێسەروبەر و بێ پێودانگانەی کە دەیبینین.

شێوازی ڕوانینی بۆ ژیـان و ڕووداوەکـان وەهـا گۆڕابـوو کـە ئەگـەر کەسێك دید و هەڵسوکەوتێکی هەبووایە کـە دژی ژیـانی دواڕۆژ بووایـە زۆر پێـی ناڕەحـەت و زویـر دەبـوو، لەبەرئـەوەی محەمـەد بـەوەوە نەوەستابوو کە بڕوا بەڕاستییەکان بکات، بەڵکو هەستی پێدەکردن و پێیان دەژیا. لەڕاستیدا چاوەڕێی هەڵسوکەوتێکی تری لێنەدەکرا.

ئەو هاوینە خۆیم بانگهێشتکرد و ماوەیەك پێکەوە بووین.

لەڕاستیدا محەمەد بووبوو بەگەنجێکی پاك و ڕاست و تێگەیشـتوو و ڕووناك، هەموو ژیانی بۆ خوا و دواڕۆژ نەخشەکێشابوو ئەگەر جارجـار بمویستایە کەمێك پێشگیری لێبکەم، دەیوت:

مامۆستا، پێویستە زۆرتـریش بکـەم سەرپێچـی و تاوانـەکانم زۆرن، لەبەرئەوە پێویستە نەنووم و نەوەسـتم. ئـەگینا، ژیـانی هەتاهـەتاییم لەمەترسـیدا دەبێـت. لـەم تاقیکردنەوەیـەدا هاوڕێیـەتی تـا دەرگـای گـۆڕە. دەبێــت تــەنها خــۆم وەڵامــی مونکــەر و نــەکیر بدەمــەوە دۆستایەتیی و هاوڕێیەتیی لەوێدا ناخوات. مادەم وایە ئایا مـن چـۆن دەتوانم بوەستم؟

کەواتــە تاکــە شــتێك کــە بتوانێــت مــن ڕزگــار بکــات تــەنها عیبادەتەکانمن.

زۆر پەرۆشی دەستکەوتنی بەهەشت و گەیشتن بەژیانی هەتاهەتایی بووم، بنەڕەت و سەرچاوەی ڕاستەقینەی ئـەم پەرۆشـییەم شـادبوونە

بەدیداری ئـەو زاتـەی کـە ئامـادەم ملیارەهـا سـاڵی ژیـانمی لـەپێناودا ببەخشم کە ئەویش پێغەمبەری نازدارە ﷺ.

دووبارە پەیامەکانی نوور کە بوونە هۆکـاری گەڕانـەوەم بـۆ ڕێگـەی ڕاست و گەیشتنم بەڕاستییەکانی ئیمان، تامەزرۆی دیـداری نووسـەری ئەو پەیامانە بەدیعوززەمان و ماچـکردنی دەسـتەکانی تیـادا بزوانـدم، هەروەك بڵێیت بەبێ بوونی ئەم زاتـە پیرۆزانـە بەهەشـتیش مـرۆڤ تێـر ناکات. محەمـەد دەرکـی بەڕاسـتی و نهێنییـەکی مـەزن کردبـوو، وەك ئەوەی پەردەکانی کاتیی کـاری لەبەردەمیـدا لابرابێـت ئـاوا بـەزانین و هەست پێکردنەوە دەدوا. ئەو دەرئەنجامانەی کـە محەمـەد دوزجـەیی لەمەڕ مردن پێیگەیشتبوو بەم شـێوەیەی خـوارەوە کـورتی کـردەوە:

مامۆستا من لە پێشدا لـە مـردن و لـە جـەنازەو لـە مـەزار و لەسـەلا و لەهەرشـتێك کـە مـردن بهێنێتـەوە یـاد، دەترسـام. دەمویسـت بـە نکۆڵیکردن لەو بابەتانەی دەربـارەی خـوای گـەورە و پێغەمبـەر ﷺ و قورئان و دواڕۆژن خۆم ڕزگار بکەم. وام دەزانی بەبڕوانەکردن بەمردن و دواڕۆژ بەرپرسیارێتی یەخەم بەردەدات.

شەوان کە دەخەوتم، ئەوشتەی کە زۆر بیزاری دەکرم تاریکی بوو، تاریکی مردن وگۆڕی بـیر دەهێنامـەوە. دەمویسـت بەفەرامۆشـکردنی ژیـان و، گـوزەرانی بێیاسـایی و بێبڕوایـی‌ـو بـەڕەلایی‌و تەنانـەت نکـوڵیکردنی دونیـا تایبەتییەکـەی خـۆم و لـەبیر بردنـەوەی مـردن و

پێشێلکردنی هەموو یاساو ڕێسایەك، دەمویست لەبەرپرسیارێتی و مردن خۆم قوتاربکەم.

ئەمە بەمانایەکی تر ڕاکردن بوو لەبەندایەتی. هەستم دەکرد کە بڕوانەکردن بەخوا و دوارۆژ دەبنە ڕێگر لەبەردەم مردندا، دوایی تێگەیشتم کە بڕوانەکردن ڕێگر نییە لەبەردەم مردن بەڵکو دەبێتە ڕێگر لەبەردەم بەهەشتدا.

سوپاس بۆ خوا، ئیتر پێش ئەوەی بمرم، دەستمکرد بەخۆشویستنی مردن، ئەجەل و گۆڕ و دوارۆژ، مەنزڵگایەکن، هۆیەکن، بلیتێکن بۆگەیشتن بەخۆشەویستان و دۆستان و خۆشبەختیی، ئاسوودەیی هەتاهەتایی. ئایا لەمردنێك ڕادەکرێت کە مرۆڤ بگەیەنێت بەخۆشەویستترین دۆستی؟

مردن من دەگەیەنێت بەخوای گەورە، بە پێغەمبەر ﷺ و زۆرکەسانی تری بەڕێز لەبەرئەمە مردنم زۆر خۆشدەوێت و هەرگیزیش ناترسم. کاتێك لە پەیامەکانی نووردا ئەم ڕوونکردنەوانەم خوێندەوە دەربارەی مردن، ڕوانینم بۆ مردن گۆڕدرا، بەڕاستی دەستمکرد بە خۆشویستنی مردن، ئەو وتانەی کە لەبەرمکردوون دەربارەی مردن ئەمانەن:

ئەی بێ چارەکان! کاتێك کە کۆچ دەکەن بۆ گۆڕستان مەڵێن: ئەی هاوار موڵك و سامانەکەمان خراپ بوو، هەوڵ و کۆششەکانمان بەهەدەر چوون لەو دونیا خۆش و فراوانە ڕۆیشتین و هاتینە ناو

چالێکی تەسك و تاریکەوە. داوای یارمەتی بکەن و بێ ئومێد مەبن. چونکە هەموو شتێکتان پارێزراوە، هەمووکردەوەیەکتان نووسراوە، هەموو خزمەتێکتان تۆمارکراوە، ئەو زاتەی کە پاداشتی خزمەتەکەتان دەداتەوە و هەموو چاکەیەك لەدەستیدایە و هەرئەو بەخشندە و میهرەبانە، ئێوە بانگهێشت دەکات و بۆ ماوەیەکی کاتی ئێوە لەنێو خاکدا (گۆڕ) ڕادەوەستێنێت، پاشان دەتانباتەوە بۆلای خۆی. چەندە بەختەوەرییە بۆ ئێوە کە ئەرك و خزمەتی خۆتانتان تەواوکرد و ئازار و زەحمەتەکان بۆ هەتاهەتایە کۆتایی هاتن، بەرەو وەرگرتنی پاداشت دەڕۆن.

ئەی مرۆڤ، ئەو خزمەتەی کە کردووتە، ئەو پەرستشانەی کە ئەنجامت داوە بە بەلاش ناڕوات، لەبری ئەم دونیا فانییە بەهەشتێکی جاویدانی چاوەڕێتە. ئیمان بهێنە و پشت ببەستە بە بەڵێنی ئەو بەدیهێنەرە شکۆمەندەی کە ناسیوتە و بەندەگیت بۆکردووە.[1]

ئەی ئادامیزاد، ئەندێشەی ئەوە نەکەیت کە مردن، نەمان، تیاچوون، ڕزین و تێکچوون و چوونە نێو تاریکستانی ئەبەدییە. بیر مەکەرەوە لەو تێگەیشتنانەی کەمردن بە خنکان و تاریکی و تیاچوون و بیر چوون و ڕزین و تێکچوون دەزانن.

ئێوە بەرەو لەناوچوون و نەمان ناڕۆن بەڵکو بەرەو بەقا و هەمیشەییبوون ڕێزتان بەستووە، نەك بەرەو تاریکی، بەڵکو بەرەو

---

١- مەکتوبات.

ڕووناکیی جیهانی نوور ملی ڕێتان گرتووه، بەرەو ویصاله ئاڕاستەکان نەك بەرەو فیراق و جودایی.[1]

ئەم دوا ڕوونکردنەوەیەی دەربارەی مردن، منی زۆر ئاسوودە کرد، "مەرگ لەناوچوون و، جوودایی نییە، بەڵکو دەستپێکی ژیانێکی هەمیشەیی و پشووی دوای ئەرك و خزمەتە، شوێن گۆڕکێیە، بەیەك شادبوونەوەی گرۆی ئازیزانە کە بەرەو جیهانی بەرزەخ کۆچیانکردووه."[2]

ئیتر، ئیمانی حەقیقی، ئیمانی تەواو: ئەو ئیمانەیە کە بەرئەنجامی خوێندنەوە و بینین و هەستکردن و تێگەیشتنە...

محەمەد، لەجۆش و تاوی باوەڕ و ئیمانەکەیدا، چووبووە جیهانێکی واوە کە هەستی نەدەکرد ئێمە ئێرەیی پێدەبەین و خوازیاری ئاوەها دۆخێکین، بەمانایەکی تر مەقامێکی ئاوات پێ خوازراوی هەبوو. ئەم هەستەم لەکاتی گێڕانەوەی خەوەکانیدا بۆ دەرکەوت. خەوی وەهای دەبینی، هەستی بەشتی وەها دەکرد و لەنێوەندی لەزەتێکی ئیمانی وەهادا دەژیا کە دونیا و خەڵکی و ڕووداوەکانی دەوروبەری نەدەبینی.

---

١- هەمان سەرچاوە.

٢- هەمان سەرچاوە.

محەمەد کە پێشووتر قوتابیمان بوو ئیتر نەك وەك قوتابییەك بەڵکو وەکو کەسێکی تێگەیشتوو و کامڵ، لەگوێگرتن و ڕوونکردنەوە و باسەکانی گەورەترین چێژ و خۆشیم وەردەگرت.

ئێستاکە ئەو قوتابی ئێمە نییە، ئێمە چووینە حوکمی قوتابی ئەوەوە. ئەو محەمەدەی کەخاوەنی پرچێکی درێژ، جەستەیەکی پڕ لەئیکسیسوار و پۆشاکی ڕیزپەڕ و هەڵسوکەوتی سەیر و نامۆ بوو، هەنووکە بەهەستان و دانیشتن و گفت و مامەڵە و بۆچوونەکانی سەرنجی دەوروبەری ڕاکێشاوە و وانەی ماندار پەخش دەکات.

## ئایا بەناوی ئایینەوە کۆمەڵ کوژیی دەکرێت؟

یەکێك لەمانە بەم جۆرە هات و چوو.

محەمەد و من و میوانێکی ترم پێکەوە چایمان دەخواردەوە، دەربارەی ئەو بابەتەی کە قسەمان لێ دەکرد، میوانەکەمان پرسیارێکی لەم جۆرەی کرد: باشە گەر دین و هەستی ئاینی مرۆڤ بگەیەنێتە ئەوپەڕی پلەی کامڵ بوون و تەواوی، دەبێت چی بەو ئیسلامییە توندڕەو و تۆقێن ویستانە بوترێت کە بەناوی ئاینەوە کۆمەڵکوژی بەئەنجام دەگەیەنن؟

بوێژی بەرامبەرم بابەتێکی زۆر گرنگ و هەستیاری ورووژاند. ئەم و چەندەهای وەك ئەم پرسیارە، لەمێشکی چەندەها کەسدا جێگیربووە.

ئیسلام لەگەڵ تیرۆریست، دین لەگەڵ کوشتاری بەکۆمەڵ، چ پەیوەندییەکی هەیە؟

محەمەد مۆڵەتی لە من خواست و وتی: "لێرەدا بابەتێکی بەهەڵە باسکراو یان تایبەتمەندییەکی چەوتی بینراو هەیە".

من دەمەوێت ئەم بابەتە لەدوو سۆنگەوە شیکار بکەم:

یەکەمیان: لە لێکۆڵینەوەی هەموو ئایەتەکانی قورئان و هەموو فەرموودەکانی پێغەمبەرمان ﷺ، وا دەردەکەوێت کە کوشتنی مرۆڤ و زیان گەیاندن بە مرۆڤ بەیەکێك لە گەورەترین تاوانەکان هەژمار دەکرێت. مرۆڤ چەندە فەرمایشتەکانی قورئان بخوێنێتەوە و پەیکەڵی بکات ئەوەندەش لەتەواویی دین تێ دەگات و گشت بۆچوون و مامەڵەکانی بەگوێرەی هێڵ و ڕێنومایییەکانی ڕێك دەخات و دەگاتە ترۆپکی کەماڵ و چاودێریی مافەکان دەکات، نەك زیان بە بەدخوازترین کەسیش ناگەیەنێت بەڵکو تەقەلای ڕزگارکردنی دەکات. لەم بارەدا موسوڵمانێکی ڕاستەقینە هەرگیز نابێت بە تیرۆریست و مرۆڤ ناکوژێت، زانراوە کە ئەمە لەلای خوای گەورە تاوانێکی زۆر گەورەیە. ئەگەر کەسێك بەناوی دینەوە تاوانێك بکات و کەسێك بکوژێت یان ئەوەتا ئەوە موسوڵمانێکی ڕاستەقینە نییە یان فەرمایشتەکانی ئیسلام هیچ کاریگەرییان لەسەری نەبووە و شوێنکاریان تیادا بەجێ نەهێشتووە.

دووەمیـان؛ دەوڵـەتێك كـە بەڕێـژەی لـە سـەدا سـەد هاوڵاتییـانی موسـوڵمانن، پێویسـتە بـە پەروەردەیـەكی ڕێكـوپێكی ئـایینی سیستەمدار ڕۆڵەكانی گۆش بكـات. بـەڵێ ئەگـەر دەوڵـەت گرنگـی بـە پـەروەردەی ئـایینی هاوڵاتییـان نـەدات یـان چـاوی لێبنوقێنێـت و بایـەخی پـێ نـەدات، ئـەوا كەسانێك ئـەو بۆشـاییە پڕدەكەنـەوە كـە شایستەی ئەو كـارەنین. یـان ئـەو كـەس و تاقمانـەی كـە دەیانـەوێت بەشـێوەیەك لەشـێوەكان زیـان بەدەوڵـەت بگەیـەنن، ئـەم دەورە ڕیزپـەڕیی و سـاردگیرییەی دەوڵـەت لەبەرامبـەر دینـەوە بەهـەل وەردەگرن و دەیقۆزنەوە، پێویستە دەوڵەت بوار بەوانە نەدات.

بـا وادابنـێین ئەگـەر لـەم وڵاتـەدا كۆلێـژی پزیشـكی دابخرێـت و پزیشكەكان لەلایەن دەوڵەتەوە پەروەردە نەكرێن ئەوا كەسانێكی بـێ توانا و لێنەهاتوو دەردەكەون كە ئەم بۆشاییە پڕدەكەنەوە و زیان بە ماڵ و گیانی مرۆڤەكان دەگەیەنن، چـارەكردنی ئەمـەو قەلاچۆكردنی ئـەو جـۆرە كەسـانە بـە ئـاوالاكردنی كۆلێـژەكان و پێگەیانـدنی پزیشكەكان بەشێواز و میتۆدی زانستیی دەبێت.

بابەتی پەروەردەی دینییش وەهایـە، هـاوڵاتی دەیـەوێت دینەكـەی فێربێت و فێـری منداڵەكەشـی بكـات، ئـەم ویسـتنە، ئەگـەر لەڕێگـەی قوتابخانەوە بە ڕێكوپێكی و شێوازێكی بـەردەوام وەڵام نەدرێتـەوە و كەسانی پسپۆڕ چاودێریی نەكەن و داواكارییـەكانی پەیوەندیـدار بـەم

بابەتەوە فەراهەم نەهێنرێت، ئەوا لە پڕكردنەوەی ئەم بۆشاییەدا كەسانێكی بەدنیاز دێنە مەیدان.

ئەگەر بابەتەكە پوخت بكەینەوە، موسوڵمانێك هەرگیز بەهاندەری ئاینیی مرۆڤێك ناكوژێت، ئەگەر بیكوژێت ناتوانێت بڵێت من موسوڵمانم.

پێویستە دەوڵەت پەروەردەی دینی هاوڵاتییان بۆ كەسانی تر بەجێ نەهێڵێت. پێویستە خۆی ئەو بەرپرسیارێتییە بگرێتە ئەستۆ. ئەگەرنا دەستپێشخەری كەسانی نیازخراپ لەئەنجامی كەمتەرخەمی دەوڵەتەوە زیانی زۆری لێ دەكەوێتەوە و هاوكات پێویستە زۆر بەبایەخەوە ئاوڕ لەو ڕاستییانە بدرێتەوە كە شاكارەكانی ((پەیامی نوور)) لەمەڕ دەستنیشانكردنی پەتا و نەخۆشییەكانی سەردەم و شێوازی مامەڵەوە چارەدۆزییان پێشكەش كردووە، چونكە پەیامەكانی نوور ڕاڤەیەكی مۆدێرنی قورئانی پیرۆزە كە چارەسەری گرفتە مەعنەوییەكانی ئەم سەردەمە دەكات و لە بیمارستانی دێرەكانیدا، من و چەندەها گەنجی زیانبەخشی هاووێنەم لەسایەی ئەم ڕاستییانەوە بووینە هاووڵاتییەكی بەسوود بۆ وڵاتەكەمان.

لەئەنجامی بەجێنەهێشتنی باسەكە بۆ من و وەڵامدانەوەی لەلایەن خۆیەوە، كەمێك شەرمنانە پرسیاری بۆچوونی منی كرد و وتی: (چی دەفەرمویت مامۆستا؟) منیش وتم: هەر بەو جۆرەیە، هاوبەشی بۆچوونەكانتم، زۆرجوان باستكرد.

وەڵامەکانی محەمەد و بۆچوونەکانی سەبارەت بە پەیامەکانی نـوور ئەوپەڕی کاریگەربوون، هەڵبەت ئەو مرۆڤـەی کـە لـەناو ڕووداوەکانـدا دەژی و لەگۆشەنیگای جیـاوازەوە لـە پێشـهات و بـاس وخواسـتەکان دەڕوانێت، بۆچوونەکانیشی دروسـت و پێکـەردەبێت. چـونکە بـەپێی ئـەو ڕێسـایەی کـە دەڵێـت: ئـەوەی تیـادا دەژی دەیزانێـت، ئـەوەش دەیزانێت دەدوێت و قسەی تیادەکـات "محەمـەدیش گوزارشـی لـەوە دەکرد کە بینیبوی و، هەستی پێکردبوو و تیایدا ژیابوو". لـەو مـاوە کورتەی کە لەگەڵ محەمەددا پێکەوە بووین چێژێکی زۆرمان لـەنزیکی و دۆستایەتی یەکتری بینی، کاتێکیش کە ڕۆیشت هۆنراوەیەکی پێدام و وتی: (مامۆستا دوای ئەوەی کە من ڕۆیشتم بیخوێنەرەوە).

منیش وەهام کرد.

## ئەی مامۆستا

لـــــەدڵت مەمپچـــــڕێنە، جیـــــام مەکـــــەرەوە
دەزانـــــی بـــــەبێ تـــــۆ نـــــاژیم، مامۆســـــتا
بەتاســـەوە چـــاوەڕێی هـــاتنی بـــەیانیانتم دەکـــرد
هەمیشە دڵ خـۆش، دەم بـە پێکـەنین بیـت مامۆسـتا

***

لەگـــەڵ تـــۆدا دۆزیمـــەوە خۆشـــیی، ئاســـودەیی
ژیـــان بـــەبێ تـــۆ دێـــز و ناشـــیرین، مەرگەســـاتە

خـــــۆراكی دڵمـــــــی، نـــــووری ئـــــاوەزمی
تـــــۆ ئامێزیـــــت، هێلانـــــەیت مامۆســـــتا
***
تـــــۆوی ئـــــەوینت چـــــانده دڵمـــــەوە
هـــــەوێنێکت لـــــەئیمان کـــــرده ڕۆحمـــــەوە
بـــۆ ڕزگـــارکردنی مـــن، زۆر نەخشـــەت کێشـــا
لـــەلای خـــوا پاداشـــتەکەی وەرگریـــت ، مامۆســـتا
***
ژیـــانێکی بـــێ ئامـــانج، ســـەرەڕۆم هـــەبوو
ڕۆحـــم پـــڕ زریـــان، دونیاشـــم تـــەنگ بـــوو
بـــاوکم نیگـــەران، دایکـــم هـــەرگریان
منـــت ڕزگـــارکرد، دەزانیـــت مامۆســـتا...
***
ئەوانـەی کـە نـەدەبوون بەمـەرد تـۆ کردنـت بـە مـەرد
بەدووی هەموو دەردێك ڕاتکرد، بەهەموویان گەیشتیت
ژیانـــــت لـــــەم پێنـــــاوەدا ســـــەرفکرد
إن شـــاء الله بەهەشـــتی دەبیـــت مامۆســـتام...

ئـەم پەیڤـە ناسـكانە نـەك بـۆ خـۆم بـەڵكو بـەناوی مامۆسـتای مەعنەویی هەزاران و سەدان هـەزار مرۆڤـەوە کـە تەفسـیری قورئـانی پـیرۆز (سـەرجەمی پەیامـەكانی نـوورە) وەرمگـرت. چـونكە هۆكـاری

بێداربوونەوەی محەمەد و شادبوونی بەم ڕاستییانە، ئەم شاکارانە بوون. کە بار و مەسەلەکە بەم جۆرەیە، کەواتە بەدڵنیاییەوە (مامۆستا)ی نێو هۆنراوەکەش من نیم.

## بەرنامەی ڕۆژێکی محەمەد

ئەو ڕووداوی هاتووچۆیە لەژیانی محەمەددا شوێنکاری زۆر قووڵ و گەلێك گرنگ و پەند ئامێزی بەجێهێشت، بۆیە هۆی ئەوەی دووبارە بەهەموو ژیانیدا بچێتەوە و، جارێکی تر نەخشە دابڕێژێتەوە. لەگۆشەنیگایەکی جیاوازەوە و سەرلەنوێ ژیانی ڕێکخستەوە، پێم وایە ئەو بەسەرهاتانەی لەمەڕ ئەو ڕووداوە ڕازئامێزە بۆی باسکردووم هەر ئەمەندە نییە، بەڵکو چەندەها بەسەرهاتی گرنگ و لایەنی پەنهانی دی هەن کە لەلای خۆی وەك نهێنییەك ماونەتەوە. لەو ڕۆژانەی کە پێکەوەبووین. پرۆگرامی ڕۆژانەکەی سەرنجی ڕاکێشام، ئەوەندەی کە من بەرچاوم کەوتبێت لەپرۆگرامی ڕۆژانەیدا، ئەمانە بوون:

١- لەڕۆژێکدا (٤) سەعات نووستن.

٢- هەموو ڕۆژێك نوێژە قەزاکان و لەهەفتەیەکدا پێنج ڕۆژ ڕۆژووی قەزا.

٣- لەڕۆژێکدا دوو ژەم خواردن.

٤- هەموو ڕۆژێك خوێندنەوەی جوزئێك (٢٠ لاپەڕەی) قورئانی پیرۆز.

٥- لەدوو ڕۆژدا جارێك خوێندنی (جەوشەنی گەورە).

٦- لەڕۆژێكدا خوێندنەوەی (١٠٠) لاپەڕە تەفسیری قورئان، كە پەیامەكانی نوورن هەروەها بەدەستهێنانی زانیاری لەفیقهدا.

پڕۆگرامێك بوو كە هەموو كەسێك ناتوانێت جێبەجێی بكات.

هەروەك بلێیت پەلەی مردن و ئاخیرەتیەتی، هەمووكاتەكانی تەرخان كردبوو بۆ بەندایەتی و پەرستشە نەكردووەكانی، لەوانەشە كە ئەو ئەم پەلەپەلەیەی زۆرباش بینیبێت و هەستی پێكردبێت، لەڕاستیدا پێویستە هەموو كەسێك خۆی ئامادە بكات، بۆ مردن و دوارۆژ پەلەی بێت. چونكە هەمووكاتێك گریمانی ڕووبەڕووبوونەوەی مردن و ئەجەل لەئارادایە.

دیارە محەمەد زۆرباش لەمە حالی بووبوو.

پەیوەندییەكانمان لەگەڵ محەمەد درێژەی دەكێشا، زوو زوو بە تەلەفون كردن یەكترمان بەئاگادەهێنا و هەواڵی یەكترمان دەپرسی، بەم تەلەفونە محەمەد هەستە بەرز و پاكەكانی خۆی دەردەبڕی، وەك ئەوەی كە وانە دەربارەی ئەركی بەندایەتی بەمن بڵێتەوە، بەتایبەتی لەڕۆژانی هەینیدا منی بەسەردەكردەوە و پیرۆزبایی ئەو ڕۆژەی لێدەكردم و، ئەم هەواڵ پرسین و پیرۆزباییەی كردبووە نەریت و بەردەوام بەسەری دەكردمەوە. كاتێك لەگەڵ محەمەددا تەلەفونم دەكرد، چێژێكی تایبەتی و بێسنوورم لەدەربڕینەكانی و شێوازی دەنگی و نەرم و ناسكی تەرزی گوفتاری وەردەگرت، ئەوەتانێ

هەندێك شێوازی گفتوگۆكردن مرۆڤ ئاسوودە دەكات و كامەرانییەكی قووڵی پێ دەبەخشێت، دەی محەمەدیش شێوازێكی لەو جۆرەی هەبوو.

## ئەو ڕووداوە سەیرانەی كە محەمەد لەڕۆژی بومەلەرزەكە، لەنوێژی هەینیدا تیایدا ژیا

دوایین تەلەفونمان كە پێكەوە قسەمان كرد ڕۆژی جومعە (١٢)ی كانوونی دووەمی (١٩٩٩) ڕاستەوخۆ دوای نوێژی هەینی بوو. لە (دوزجە)وە تەلەفونی بۆكردم. لەوكاتەدا منیش لە قەزای (تورهاڵ)ی سەر بە (تۆكان) میوانی هاوڕێ بەڕێزە هاوپیشەكانم: نورالدین پالا و حەققی كالایجی بووم.

قسەكردنم لەگەڵ محەمەددا زۆر درێژەی كێشا، محەمەد وتی:

مامۆستا (هاتووم بۆ دوزجە، بۆ ئەوەی سیلەی ڕەحم بەجێبهێنم و خێزانەكەشم ببینم...)

لەبەرئەوەی كە تەلەفونی بۆ مۆبایلەكەم كردبوو، لەو ڕووەوە كە قسەكردنمان زۆر درێژە نەكێشێت، پیرۆزبایی ڕۆژی هەینی و نوێژی جومعەم لێكرد. دوای تەمەننا و هیوا خواستنێكم لەدڵەوە بۆی، سوپاسم كرد و ویستم كۆتایی بەقسەكردنەكەمان بهێنم، بەڵام نەیدەویست تەلەفونەكە دابخات و جیابێتەوە، تێگەیشتم لەوەی كە دەیەوێت شتێكی زۆر گرنگ بڵێت هەربۆیە وتی:

«مامۆستا، نوێژی ئەم جومعەیە، نوێژێکی تر بوو، لە ژیانمدا نوێژی وەهام نەکردووە...»

بە تامەزرۆییەوە پرسیارم کرد و وتم: «چۆن؟!»

بەدەنگێکی هەست بزۆێن و پڕ لەناسکییەوە، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و دووبارەی کردەوە و وتی: «نوێژێکی تەواو جیاواز بوو» لەناکاو هەستم کرد بەدەنگێکی لەرزۆك و بەپچڕپچڕی وشەکانی تەواو دەکرد. لەنێو جۆشێکی بێ وێنەدا بوو، بۆ ئەوەی هەنیسك و گریەکانی دەرنەبڕێت زووزوو خۆی دەخواردەوە. زۆر مەراقم بوو بزانم ئاخۆ چی ڕووی دابێت لەم ڕۆژی جومعەیەدا، ئاوەها کاری کردووەتە محەمەد و هەستی خرۆشاندووە:

«محەمەد دەی کەمێك وەرەوە سەرخۆت، منیشت پەرێشان کرد خوای گەورە قبووڵی بکات. تامەزرۆی نوێژی جومعەکەت بووم، باسی بکە، گوێم لێگرتوویت»

دووبارە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و دوای ئەوەی هەوڵیدا خۆی هێور بکاتەوە، بەردەوام بوو.

«مامۆستا، نازانم باسکردنی هەموو ئەوەی کە بینیوومە شتێکی چۆنە؟ ئایا لێی بەرپرسیارم؟»

هەتا دەهات منیش زیاتر ئۆقرەم نەدەما.

وتم: «یانی چی، باس کردنی هەموو ئەوەی کە دیوتە؟ مەگەر چیت بینیوە کە ئەوەندە دوودڵیت لە باسکردنی؟»

وتی: جا چی نییه... لەناکاو دەستیکرد بەهەنسکدان. مامۆستا، چی ڕوویدا لەنوێژی ئەم جومعەیەدا... چی ڕوویدا... وەك بڵێیت بەرەو جیهانێکی تر ڕۆیشتم، من لەجیهانێکی تر بووم.

هەتا دەهات هەنسکدانی زیادی دەکرد. من لەسەرێکی تەلەفونەکەوە، محەمەدیش لەسەرەکەی تریەوە بەرامبەر بەیەك فرمێسکمان دەڕشت. تێگەیشتم کە شتێکی زۆرگرنگ ڕوویداوە. دووبارە محەمەد منی بزواند و خرۆشاندمی و، خۆی سازدابوو کە لەڕوانگەی ڕووداوێکی پەند ئامێزەوە وانەیەکی گرنگم دابدات.

محەمەد بەو دڵە پاکە و هەستە بێگەردەیەوە پێشبینیی ئەوەم لێدەکرد کە ئەو شتە بەرزانەی کە چاو نایانبینێت ئەو بینیبونی، لەبەرئەوەی محەمەد گەیشتبوویە مەقامێکی مەعنەوی وەها بڵند کە دەیتوانی لەو مەقامەدا زۆرشت ببینێت، وەڵێ خۆی نەی دەزانی کە خۆی لەکوێ بینیوەتەوە. کەهەنیسکەکانی کەمبوونەوە، وتم:

«محەمەد گوێبیستی تۆم» پێویستە بۆمی باس بکەیت، لەبەرئەوەی زۆرکەس هەن کە پەند لەژیانی تۆ وەربگرن، خۆ ئەگەر باسیشی نەکەیت بەرپرسیار دەبیت.

بەدەنگە شیرین و هەست بزوێنە تایبەتییەکەی خۆی دەستیکرد بەگێڕانەوەی:

«بۆ نوێژی جومعە چووم بۆ مزگەوت. لەلای چەپی مزگەوتەکەوە شوێنێکی بەتاڵم دیتەوە لەوێ دانیشتم. وتارخوێنەکە شتی زۆر خۆشی باس دەکرد.

کە وتاربێژ وتاری خوێند، منیش چوومە ناو جیهانی خۆمەوە»

دووبارە محەمەد دوودڵ بوو لەوەی کە باسی بکات یان نەیکات منیش وریام کردەوە و وتم: ئێ، پاشان؟

پاشان، دەستمکرد بەگەشتێك لەدونیاکەی خۆمدا. ئەم گەشتە چۆن باس بکەم مامۆستا؟

دووبارە بە زمانێکی تەتەڵەوە بەردەوام بوو لەسەر قسەکردن:

« لەم گەشتەدا کە لێی تێنەگەیشتم و نەمزانی چۆن بوو، کەعبەی پیرۆز بەهەموو شکۆمەندییەوە لەبەرامبەرمدا دەردەکەوت، خۆم لەو قەرەباڵغییە دڵڕفێنەدا بینییەوە، هەرلەوێدا بۆ نوێژی هەینی ڕیزمگرت. ناتوانم ئەو هەست و جۆشە دەرببڕم! ، لەدوای نوێژ تەماشامکرد دەرگایەك لەناو کەعبەدا کرایەوە، هەندێك کەس بەرەو ئەوێ دەڕۆیشتن، بەڵام هەموو کەسێکیان نەدەکردە ژوورەوە. منیش وتم بابەختی خۆم تاقیبکەمەوە، بزانم لەوێ چی هەیە، بەرەو دەرگاکە ڕۆیشتم کە گەیشتمە دەرگاکە سەیرم کرد کەسێکی زۆر چاك و ئەوکەسەی کە من زۆر خۆشم دەوێت لە دەرگاکەدا چاوەڕێ دەکات. کە بینیم باوەشم پێداکرد و وتی: وەرە ژوورەوە محەمەد، بزانە چی دەبینیت، منیش بە گەرم و گوڕییەوە چوومە ژوورەوە،

دەبینم شوێنەکە وەك کۆشکێکی مەزن وەهایە، ڕێك لەبەردەمیدا قەرەباڵغییەك، لەبەردەم قەرەباڵغییەکەشدا سەکۆیەك دروستکرابوو. لەسەری هەموویانەوە حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ، حەزرەتی أبوبکر، حەزرەتی عومەر و هەندێك زاتی ترو مامۆستا بەدیعوزەمان هەبوون. کە من چوومە ژوورەوە، مامۆستا بەدیعوززەمان ئاماژەی بۆ کردم و بانگی کردم بۆلای خۆی قۆڵی گرتم و وتی: «بەخێربێیت براکەم محەمەد» بەتەواوی بردمیە بەردەم پێغەمبەر ﷺ وتی: یارسول الله ئا ئەمە محەمەدە»

پێغەمبەر ﷺ دەستی هێنا بەسەرمدا. منیش دەستە پیرۆزەکانیم ماچکرد.

پێغەمبەر ﷺ بەشەفەقەتەوە سەیری ڕوخساریکردم و تەنها وتی: «ما شاء الله».

« لەوکاتەدا دەنگی بانگ بێژی مزگەوتەکەم بیست و هاتمەوە سەرخۆم. سەیرمکرد لەمزگەوتەکەی دوزجەدام.»

« نازانم مامۆستا ئەم گەشتە خەیاڵ بوو یان نا، بەڵام هەوا پیرۆزەکەی ئەوێ کاریکردە سەر جگەرم. کەدەستم بەری کەوت هەستم بەگەرماییەکەی کرد.» منیش هەر ئەوەندەم توانی بڵێم: (محەمەدەکەم پیرۆزبایت لێدەکەم) دووبارە دەستمانکردەوە بەگریان. پاشماوەیەك وتی: « مامۆستا کۆمەڵێکی زۆر جیاواز هەبوون لە مزگەوتەکەدا »

پرسیارم کرد و وتم: کۆمەڵێکی چۆن؟

وتی: «تاقمێکی زۆر جیاواز بوون. هەتاکو ئێستا گرۆی مزگەوتی وام نەبینیوە. بەتایبەتیش لای ڕاستی مزگەوتەکەیان پڕکردبوو. هەموو یەك جۆر جلیان لەبەردابوو. بەئادابێکی لەڕادەبەدەر و جوانەوە نوێژیان دەکردوو و شێلگیرییان جێگای سەرنجدان بوو. یەکەمجار وا گومانم برد کە ئەمانە سەربە تەریقەتێك بن. بەڵام وانەبوو. وەك بڵێیت لەنێو دیمەن و هەڵسوکەوتێکی زۆرتەواودا بوون کە لەسەررووی مرۆڤایەتییەوە بوون. ئەو چێژ و لەزەتەی کە لەناو ئەو نوێژەدا وەرمگرت، باس ناکرێت. ناخم پڕبوو بوو لەخۆشییەك کە دەستەوسانم لە پەسندکردنی، بەدرێژایی نوێژەکە گریام و وەستام.»

من نوێژێکی ئاوەهام نەبینیبوو بەکۆمەڵی واش نەگەیشتبووم... ئاوەها هەوایەکی مەعنەویم هەڵنەمژیبوو، محەمەد خۆی نەدەناسی، بەڵام لەناخ و هەناویدا ڕووداوی زۆر پیرۆز و گەلێك بەرز قوڵپیان دەدا. هەموو ئەمانە ئاماژەیەك بوون بۆ بەرزبوونەوەی پلەی مەعنەویی محەمەد.

ئیدی تێگەیشتم کە ئەو لەگەڵ مەلائیکەت و وەلی و شەهیداندا نوێژیکردووە. بۆئەوەی زۆر هەستی محەمەد نەبزوێنم، دووبارە ویستم پەیوەندییەکە کۆتایی پێ بهێنم. دوایین ڕستەکانی محەمەد بۆ من ئەمانە بوون: «مامۆستا دوێنێ نامەیەکم بۆ نووسیت و بۆم ناردیت. تەمەن کورتە لەوانەیە یەکتر نەبینینەوە، گەردنم ئازاد بکەن

و دەستەکانتان ماچ دەکەم». منیش لەدڵەوە نزای خێر و ئاواتی بەرزم بۆ خواست و بەچاوی پڕ فرمێسك و بەدەروونێکی تەڕ و دڵی بەکوڵەوە تەلەفونمان داخست. وەك بڵێیت ئەم پەیوەندییە بۆ محەمەد کۆتا پەیوەندی و ماڵئاوایی بوو.

## هەواڵی زەمین لەرزەکەی دوزجە وەك بۆمبێك کەوتە نێو ماڵەوە

نزیکەی پێنج یان شەش سەعات بەسەر پەیوەندییەکەماندا تێپەڕی بوو، لەگەڵ کاك نورالدین پالا و حەققی کەلایجی، کە بۆ سەردانیان چووبووومە (تورهاڵ) خوانی ئێوارەمان پێکەوە خوارد.

لەو کاتەدا سەعات هەشت بوو، هەواڵەکان پێشکەش دەکرا و، یەکەم هەواڵ هەروەك ئەوەی بڵێیت بۆمبایەك کەوتبێتە ناومانەوە هەژاندینی، ئەو هەواڵەی کە لەدوزجە بوومەلەرزەیەك بەپلەی (٧.٤) ڕوویداوە، تووشی شۆك بووم و لەشوێنی خۆمدا وشك بووم.

بێگومان یەکسەر محەمەدم هاتەوە یاد،کە پێنج تا شەش سەعات لەمەوبەر پەیوەندییەکی دەردەداریمان کرد و ئەسرینمان ڕشت و تەنانەت ماڵئاوایشمانکرد، وەك کاردانەوەیەکی کتوپڕ لەناکاو هاوارم کرد: (محەمەد).

ئەو هاوڕێیانەی کە پێکەوە لەسەرخوان بووین سەریان سوڕما، لەبەر کاریگەری هەواڵەکە، بابەتەکەم نەکردەوە و، بەهەموو نیگەرانی و ترسێکەوە سەیری هەواڵەکانم کرد.

ئاخ.. محەمەد ئاخ.. تۆ چەند مانگێکە وەك بەرەو شوێنێك هەنگا و هەڵبنێیت دەڕۆیشتی. (مردن و قەبر...) هەموو هەڵسوکەوتێکت، هەر قسەیەکت، گشت بایەخ و فرمێسکەکانت هێمای ئەم ڕاستییانەیان دەکرد. وەك بڵێیت هەوڵیدەدا ئەمە بەدەوروبەرەکەی ڕابگەیەنێت، یەکسەر دەستمدایە تەلەفونەکە بەڵام مەخابن بەهیچ جۆرێك نەمتوانی پەیوەندی بە محەمەدەوە بکەم، تا دوو ڕۆژ پاش بوومەلەرزەکە هیچ هەواڵێکم لەبارەی محەمەدەوە دەست نەکەوت، ناچار ڕۆژی سێهەم خۆم بەرەو دوزجە کەوتمە ڕێ.

ئەو دوزجەیەی کە من زۆر شارەزای بووم، بوو بوو بەگۆڕەپانی مەحشەر و کارەسات، کەس ئاگای لەکەس نەبوو کەسیش نەیدەزانی چی بکات، (بازێڕی هەڕاجی گیان) بەهەموو ئەو واتایانەی کە هەڵیدەگرێت لەوێ بەرجەستە بووبوو.

خانووە ڕووخاوەکان، کۆڵان و شەقامە بەربات بووەکان، کەل و پەلی پەرشوبڵاو، مرۆڤە بێنەواکان، کۆرپە بێلانەکان، قریشکە و هاوارەکان، شیوەنەکان، خۆگرتن چەند زەحمەتە!

ئەوانەش کە چووبوون یارمەتی و کۆمەکی خەڵك بکەن و چارەسەرێکیان پێشکەش بکەن، خۆشیان بێ چارە مابوونەوە و

کەوتبوونــە بارێکــەوە کــە خۆشــیان پێویســتیان بەیارمــەتی هــەبوو، چونکە تابلۆکان ئەوەندە ڕووخێنەر و سوتێنەر بوون کە هەرگیز مرۆڤ نەیدەتوانی خۆی لەئاستیاندا ڕابگرێت.

لەنێوەنــدی ئــەم شــیوەن و شــەپۆڕانەدا وتــەکانی پــیرە پیاوێــك تروسکایی ئومێد و ئارامیان هاویشتە نێو دونیا تارەکەمەوە:

– پیرە پیاو: خــودا بەخشــی، هــەر خــوداش ســەندییەوە، ئێمــەش بەنــدەین، لــەدونیای تاقیکردنــەوەداین، إن شــاء الله پاداشــتەکەی لەدوارۆژدا وەردەگرین. کاتێك بەنێوان دار و پەردووەکانـدا تێپـەڕیم و گەیشتمە ماڵی محەمـەد، بینـیم خانووەکـەیان تـەختی زەوی بـووە و تەپیوە، ئیدی ئەو ئومێدەی لەدڵمدا مۆڵیدابوو، نەما و چوو بەهەوادا، تـۆ بڵێیـت بەسـەلامەت دەرچـووبن ئـاخر بەسـەلامەت دەرچـوون لـەم شوقەیە چ گونجاوە؟! لەوێدا دۆش دامام .

## لەکاتی زەمین لەرزەکەدا محەمەد نوێژی کردووە

ســەیری ڕاســت و چــەپم کــرد تــاکو بــزانم چــی بەســەر دانیشــتوانی شوقەکەدا هاتووە. پرسیم لەپیاوێکی پیر کە نـاوی کـەمال بـوو: ئـەم ماڵــە قوتابییــەکی منــی تێــدابوو نــاوی محەمــەد بــوو. ئایـا خـۆی و خێزانەکەی چییان بەسـەردا هـاتووە؟ پیـاوە پیرەکـە بەهەڵکێشـانی ئـاخێکی قووڵـەوە وتـی: (مامۆسـتا مەپرسـە) ئـەو خێزانـە جـەرگی ئێمەیان سوتاند و ڕۆشـتن. ئـەم هەواڵـە سـوتێنەرە منیشـی سـوتاند. لەناکاو بروسـکەیەك دای لـە سـەرم و وەك تەزوویـەك هـەموو گیـانمی

سەرەوخوارکرد و بەوێنەی زەمین لەرزەکە هەژاندمی. بگرە ئەمە یەکەمجارە کە ببینم هەواڵی ناخۆش و سەخت ئابەو جۆرە مرۆڤ کلۆڵ و لاواز بکات. هەموو جەستەم لەناکاو بووبە ئارەق، کەواتە بەهەواڵی ناخۆش مرۆڤ ئارەق دەکاتەوە!

پیاوە پیرەکە بەردەوام بوو وتی:

من ئەو خێزانە باش دەناسم، خزمایەتییەکی دووریشمان هەیە، نزیکەی پێنج ساڵیش دراوسێ بووین. خێزانێکی زۆرچاك بوون بەتایبەتی محەمەد بەتەواوی بووبوو بەفریشتە، بەڵێ فریشتە، بەلام هەموویان لەژێر ئەم دار و پەردووەدا گیانیان لەدەستدا.

کاتێك کە جەستەکان دەرهێنرانە دەرەوە منیش لەسەریان بووم، چاوی پیاوە پیرەکە لەناکاو هەروەك بەهارەکانی هەڵقوڵی و لەشوێنی خۆیدا چۆکی داداو وتی:

«ئای... کوڕم!» هەتا گەیشتوومەتە ئەم تەمەنە شتی وەهام نەبینیوە، سەرنجێکی چاوە تەڕەکانیمدا، تۆ بڵێیت چی بووبێت؟

مامە پیرەش بەردەوام بوو:

«کە گەیشتینە سەر لاشەکان، چیمان بینی؟ بەرماڵەکان ڕاخرابوون لەسەر زەوی و هەموو خێزانەکە لەسەر نوێژ و لەبەردەم خوای گەورەدا بوون. .

دوایەمین هەناسەکانیان لەسەر بەرماڵ داوە.." پیاوە پیرەکە خۆی پێنەگیرا و دەستیکرد بەگریان.

مەرگێکی ئاوا جوانم نەدیوە، شتی ئاوەها نەبینراوە، مردنی ئاوەها بەنسیبی هەموو کەسێك نابێت، ئەو خێزانە جیاواز بوون محەمەد لـەو خێزانـەدا بـوو، محەمـەد فریشـتەیەك بـوو، مـن گـەنجی ئاوەهـام نەبینیوە.

مامەی پیر فرمێسکەکانی سـەر کوڵمـە لۆچ و ژاکاوەکـانی سـڕی و کەوتەوە گۆ:

«محەمـەد لەپێشـەوە ئیمـام بـووە، جوببـەی لەبـەردا و مێـزەری بەسـەرەوە بـوو، دایـك و بـاوك و خوشـك و براکەشـی لـەدواوەوە جەماعـەتیان دەکـرد. کتێبـی ((وتـەکان)) کـە تـەفسـیری قورئانـە و نوسراوی مامۆستا نورسییە بەدەستی محەمەدەوە بوو، پێدەچێت کە نوێژەکـەیان کـردووە بێئـەوەی لەسـەر بەرماڵەکـە هەسـتابنەوە تەفسیری قورئانیان خوێندبێتەوە...»

بەگوێرەی وتەکانی مامەی ڕدێن سپی، کتێبەکەی دەستی محەمـەد کراوەبـووە و، محەمـەدیش بەسـەر کتێبەکـەدا کـەوتووە و بەشـێکی سەرنج ڕاکێشی ئەو کتێبـەی کردبـووەوە کـە (پـەیامی حەشـر) بـوو، واتە بەشێك بوو کە لەمردن و ئەجەل و ڕۆژی دوایی دەدوا.....

واتە، خـەڵکی ئـەم ماڵـە، بەنوێـژ و تەفسـیری قورئـان کـە دواڕۆژی ڕوونکردووەتـەوە، بـەرەو پـیری مـەرگ ڕۆیشـتوون و پێشـوازییان لێکردووە.

بارێکی سەیر... دۆخێکی پەندئامێز

مامەی هەست ناسك بەردەوام بوو: كە گەیشتینە سەر تەرمەكان و ئەو حاڵەتەمان بینی، فریاگوزاران، نزیك نەبوونەوە و وتیان:

«ئەمانە بەتەواوی شەهیدن، ئێمە بەم دەستە پیسانە و بەم بێ دەستنوێژییەمانەوە دەستیان لێنادەین»

پاشان پیاوێكی بەدەست نوێژ و دینداریان بانگكرد، هات، باوەشی كرد بەجەستەكاندا و هەڵیگرتن، كتێبەكەشی لەنێوان هەردوو قۆڵی محەمەددا ڕاكێشا و بەئەسپایی دەریهێنا.

كاتێك گوێبیستی ئەم دیمەنە هەست بزوێنانە دەبووم، هەروەك مۆم لەتاوا دەتوامەوە و هەموو جەستەم بووبووە دیدە و دیدەشم لەتاو شینی دڵم شیوەنی دەكرد.

ئەی خوایە لێبووردن و چاودێریی و بەزەییت چەندە سەنگینە... بەرزترین مەقام، مەقامی شەهیدیت كردە نسیبی بەندەیەكت كە تۆی زۆر خۆشدەویست، دەسا خوایە گیان بمانكەیتە شایستەی لێبوردەیی و میهری خۆت... آمین

ماڵئاواییكردنی بەندەیەك كە خۆشەویستیی خوای كردبووە سەرمەشقی ژیانی، خواحافیزیی كردنی لە ژیان، شادبوونی ئەم بەندەیە بە ئەجەل و پاشەڕۆژ، بەڵگەیەكی سەرنج ڕاكێشە بۆ ئەوانەی كە سەرنج دەدەن یان لانی كەم بەسەرنجدان لەخەوی بێئاگایی ڕادەچڵەكن.

(خۆشویستنی خوای گەورە و بوونە بەندەی) چارەسەری هەموو گرفتێك و دەرمانی هەرتەنگی و ڕزگاربوونە لەكۆت و بەندی هەموو كارەسات و ناخۆشییەك.

محەمەدی دوزجەیی نموونەیەكی زیندوو و بەرچاوە نەك جارێك بەڵكو سەدان جار دەیسەلمێنێت كە چەمكی (ناسینی پەروەردگار و بوونە بەندەی ئەو) و بە كرداریكردنی دەبێتە كلیلی چارەسازی گشت ناهەمواری و تەنگییەكانی كۆمەڵگا، هەر لە یاخی بوون لەدەوڵەت و، سەرپێچی كردنی یاسا، ئاژاوە نانەوە، زیان گەیاندن بە ئەندامەكانی خێزان و كۆمەڵگا....

گرتنەبەری ڕێگەی چاكسازیی لەلایەن لاوێكەوە كە لەژیان بێزاربووبێت و گوێڕایەڵی یاسا و بنەماكان نەكات و، لەكۆمەڵگا یاخی بووبێت، دیارە كارێكی هەروا ئاسان نییە، هەربۆیە بۆ ئەوانەی كە توێژینەوەی كێشەكانی ڕۆژگاری ئەمڕۆی كۆمەڵگا دەكەن، بابەتێكی فرە وانەبەخش و كاریگەرە...

ئاشتكردنەوەی خەڵكی لەگەڵ یەكتردا، تەبایی دەوڵەت و میللەت، دروستكردنی كۆمەڵگایەكی لێبووردە، بۆ دووركەوتنەوە لەناڵەی چەك و بۆنی خوێن و تراژیدیای جەنگ، پێویستە گرنگی بدرێت بەچاكسازیی پەروەردەی دڵ و هزر و مێشك، (بڕوابوون بەخوا و دواڕۆژ) ڕۆڵێكی گرنگیان هەیە لەچەسپاندنی ئەم چەمكانە و بزواندنی هەستی خودكۆنترۆڵ لەمرۆڤدا. ئیدی لەوێشەوە ئەدگارەكانی

کەشێکی ئاسوودە و ژیانێکی لەبار بۆ هەمووان بەدەردەکەوێت، خۆری ئاواتی مرۆڤایەتیش لەئاسۆکانی کامەرانیی و هێمنیدا هەڵدێت.

نموونەی زیندوویش محەمەد دوزجەییە.

ئەوکات کە دوزجەم بەجێهێشت، تەنها محەمەد نا بەڵکو دونیا و یادگارییەك وەك نوور دەدرەوشانەوە، هێندەی دەریا قووڵەکانیشیم بەجێ هێشت.

ئەو ڕووداوانەی کە ئەو بەسەریدا هاتن و ئەو تابلۆیانەی کە ئەو نەخشاندنی زریانێکی بێ ئارامییان لە دەروونمدا وروژاند، ئیتر ئەو قوتابی من نییە، بگرە من قوتابی ئەوم، چونکە ئەو پلە و مەنزڵانەی کە ئەو پێیگەیشتبوون زۆرمەزن و بڵندبوون.

خوای گەورە بەهەشتی جاویدانی بکاتە جێگەی و لەدواڕۆژ و بەهەشتیشدا بەیەکترمان شاد بکاتەوە.

## ئەو نامەیەی محەمەد ڕۆژێك بەر لەزەمین لەرزەکە ناردبووی

ئەوەی کە ئومێدی بەمن بەخشی و دڵی خۆشکردم و هەندێك لە پەژارەکانی لە بیربردمەوە، ئەونامەیە بوو کە بۆ منی نووسی بوو و ناردبووی. کاتێك هاتمە ماڵەوە نامەکەی محەمەدی ڕەحمەتی گەیشتبوو، بەجۆرێك وەك بڵێیت کە زۆر بەتاسەوە بمەوێت محەمەد ببینم، نامەکەم کردەوە، بەتەرزێکی زۆر هەستیار و پاکژ نوسرابوو،

نوسراوێك كه به نزا و سڵاو دەستیپێكرد دەمەوێت ئەم نامەیە وەك بەڵگەی پەند و ئامۆژگاری پێشكەش بكەم:

بەڕێز، مامۆستای زۆر بەنرخم:

بەدڵێكی پڕخۆشەویستیی و دوعاوە دەستەكانت ماچ دەكەم، دەمەوێت ئەم نامە دوور و درێژەت لەقوتابییەكەوە پێشكەش بكەم كە زۆر چاك دەیناسیت. بێگومان ئێوەش زۆر دەمێك بوو دەتانویست نامەیەكی بەم جۆرە لەبارەی ژیانی خۆم و بەخامەی خۆم بنووسم، مامۆستا كێ دەزانێت لەوانەیە دوا گفتوگۆمان بێت یان سەرەتای كۆتاییيەكەی بێت، لەبەرئەوە دەمەوێت ناخم هەڵبڕێژم و هەندێك ئاسوودە ببم. ئیدی ئەم قوتابییەی كە باش دەتناسی، زیاتر ئاشنای دەبیت و، بەم شێوەیەش ئەوەی كە بەڕێزتان دەتانەوێت ئەنجامی دەدەم، هەروەك لەپێشدا بۆ جەنابتانم باسكرد، ئێمە كۆچەرییەكی بولگاری بووین. لە بولگارستان لە (كرجائالی)دا دەژیاین. پارتی كۆمۆنیستی بولگاری بۆ گۆڕینی ناو و ڕواڵەتە ئیسلامییەكان لەساڵی (١٩٨٥)ەوە دەستیانكرد بەتەنگ هەڵچنین. هاوڵاتییانی ڕەسەنی توركی لەژێر ئەشكەنجەیدا بوون خەڵك لەتوانایدا نەمابوو خۆڕاگرێت، لە ساڵی (١٩٨٩) هاتینەوە بۆ نیشتمانی خۆمان.

من ئەو كات تەمەنم یانزدە ساڵان بوو، لەبەرئەوەی كە لەوەو پێش بە توركی خوێندبووم، لە پۆلی چوارمی سەرەتاییەوە وەریانگرتم، باوكم هەنگەوانێكی زۆر چاك بوو، خەریكی بازرگانی هەنگوین بوو

لەبەرئەوە زیاتر لە (چۆرلو)و ئەستەمبوڵ ماینەوە. ئەم چوار ساڵەی کۆتایی هاوینانیش لەدوزجە دەماینـەوە، ئەگەرچی لەدوزجـەش زۆر نەدەماینـەوە، بـەڵام زۆر خۆشـم دەویسـت هـەموو هاوینێـك مانگێـك، دوومانگ لەدوزجە دەمامەوە و، لەو پشووە کورتـەدا ئاسـوودەییەکی زۆرم بەدەسـت دەهێنـا، لەبەرئـەوە زۆر خۆشـحاڵم کـە پـێم دەڵـێن محەمەدی دوزجەیی.

من قۆناغی سـەرەتاییم لـە (چـۆرلو) و ناوەندیشـم لـە ئەسـتەمبوڵ خوێندووە و چ لەچۆرلۆ و چ لەئەستەمبوڵیشدا ئەو شوێنانەی کە لێـی دەماینـــەوە ناوچـــەگەلێکی دەوڵەمەندنشـــین بـــوون. هاوڕێکـــانی دەوروبەرم هەموو شتێکیان بەگاڵتە گرتبوو. یاخی و هەرزەکار و دژی هـەموو یاسـایەك بـوون، لەبەرئـەوەی کـە دەرامـەتیان بـاش بـوو دەستکەوتنی هـەموو شـتێك لـەلایان ئاسـان بـوو، کاتێـك کـە هـەموو داواکارییـەکانیان دەهێنرایـە جـێ، ژیـانێکی بـێ بەرپرسـیارییەتی و تەوەزەلیان بۆ دروست بووبوو. نەخاسمە کاتێك لـەقۆناغی ناوەندیـدا بووم هەندێك مامۆستا بەرامبەر دین و دینـدارەکان قسـەیان دەکـرد و ڕادەوەسـتان. باسـیان لـەوە دەکـرد کـە دیـن بیروباوەڕێکـە مـۆدێلی نەماوە و شتێك کە پێی بڵێن ئاخیرەت و لێپرسینەوە لەئارادا نییـە و، مرۆڤیش لەم ژیانەدا دەتوانێت بـەپێی ویسـت و کـەیفی خـۆی بـژی و تەمەن بەسەر بەرێت، ئەو مامۆستایەشمان کە وانەی دینی دەوتـەوە زۆر کەمتەرخەم و لاواز بوو، وەڵامی ئەو پرسیارانەی نەدەدایـەوە کـە

دەمان پرسی، تەنانەت وەڵامی مامۆستاكانی تریشی نەدەدایەوە كە بانگەشەی بیرۆكەی بێباوەڕیی و نكوڵیكردنی بەدیهێنەریان دەكرد، لەوانەشە لەو ماوەیەدا لەژێر فشار و چاو سووركردنەوەدا بووبێت.
بەم جۆرە لەناخمدا بۆشایی و بیرۆكەی بێباوەڕیی سەری هەڵدا، دایك و باوكیشم بەرهەڵستی ئەم دۆخەیان دەكرد، بەڵام كێ گوێ دەگرێت.
بەبانگەشەی ئەوەی كە «مامۆستاكەمان باشتر دەزانێت» خۆمان دەپەڕاندەوە. بەو پێیەی كە خێزانەكەمان لەبولگارستانەوە هاتبوو، ڕابردوویەكی پتەوی ئیمانیمان نەبوو، بەم هۆیەوە لەهەستی ئاینی و بەها دینییەكان بێ بەش و خاڵی بووین.
كاتێكیش كە هاتینە ئامادەیی، ئەم بارە زیاتر پەرەی سەند، لەدەوروبەرماندا گروپێك هەبوون بەناوی «گەنجێتی بێ یاسا» ئەم گروپە سەرپێچی ژیان و گوێنەدان بەیاسا و پشتگوێ خستنی شتانی جددی و وڕكگرتنیان كردبووە دروشم و چەند هەرزەیەكی ناز و نوزكەر و جلوبەرگ و هەڵسوكەوتیان و قسەكردنیان و پەیوەندییان بەتەواوی سووك و بێڕێز و سەرنج ڕاكێشبوون.
سەرەڕای ئەوەی كە خێزانەكەم دارا نەبوون، كەچی من هەروەكو ئەوان دەژیام و لەم ڕووەوە لەگەڵ دایك و باوكمدا هەمیشە پرتە و بۆڵەمان بوو، ئەم دۆخەی من دایكمی زۆر دڵگران دەكرد و بەردەوام دەگریا. لەگەڵ باوكمدا هەموو پردەكانی لێك تێگەیشتنمان پساند، چەندەها جار منی لەماڵەوە دەركردووە، خەرجی نەداومەتێ، بەڵام

من هەر لە «گەنجێتی بێ یاسا» نەدەگەڕام، چونکە بەلامەوە ژیانی بەرەڵایی و لێ نەپرسینەوە خۆش بوو.

کاتێك گەیشتمە دوا قۆناغی ئامادەیی، خۆم لە سەرۆکایەتی ئەو گرووپەدا دیتەوە، هەندێك لە وانەکان بەکۆششێکی کەمەوە و هەندێکی تریشیان بە هەڕەشەکردن لە مامۆستاکە دەردەچووم.

لێرەدا ئەو خاڵەی جێگەی سەرنجم بوو بریتی بوو لەو (گەنجیەتییە بێ یاسا)یەی کە سەرەڕای ئەوەی کە بێسەروبەرەیی و پەرشوبڵاو و، بێباوەڕ و ئاشووب سازبوون، کەچی لەناوەڕۆکدا هیچ ئامانجێکی سەردەمی بوون و، پێشکەوتن خوازی و مەردییان لێنەدەخوێنرایەوە.

جا ئەو گەنجانەش کە بەکەسایەتییەکی پابەند بەدینەوە ناسرابوون و بەهەڵسوکەوت و هەستی جوانیان بووبوونە نموونە بۆ دەوروبەریان، لەتیروتوانجی گاڵتە و ڕابواردنی ئێمە ڕزگاریان نەدەبوو، جارێك بەدواکەوتوویی، جارێکیش بە پەرگیریی و ناشارستانێتیی سەرمان دەخستە سەریان، ئەگەرچی ئەو برادەرانە، دەوڵەت و میللەتیان هەزارجار لەئێمە زیاتر خۆشدەویست، بێگومان ئەوکاتە ئەمە زۆر کەیف بەخش و کات بەسەربەربوو بۆ ئێمە.

دوای تەواوکردنی ئامادەیی، باوکم لەگەڵمدا سەودایەکی کرد و وتی:

- (یان دەچیتە زانکۆ یان بەهیچ جۆرێك چاوەڕێی پارە و خەرجی مەبە) سەیرم کرد بڕیارەکە جددییە و گلۆڵەکەم کەوتووەتە لێژی، چ

بۆ نەبڕینی خەرجییەکەم و، چ بۆ ئەوەی گۆڕانکاری بەدەوروبەری خۆمدا بهێنم و لەژینگەی جیاوازدا ڕابوێرم، مانگێك سەعیم کرد، زانکۆم بەدەستهێنا. هەزاران جار سوپاس بۆ خوا کە بەهۆی بەدەستهێنانی زانکۆوە کۆتایی بەژیانی ئاڵۆز و خراپیی من هات.

هەر کە هاتمە زانکۆوە لەگەڵ هاوبیرە نزیکەکانمدا گروپێکمان پێکهێنا، بەمەبەستی بەرپاکردنی زنجیرەیەك ڕووداو کە بگاتە ڕادەی دەرکردنمان لە زانکۆ. چونکە بۆشاییەکی وەها لەناخمدا هەبوو کە لە شەڕەنگێزی و بێزارکردنی خەڵك و پێشێلکردنی یاسا، لە هەڵسوکەوتی ناشیرین و دژ پەسەندی و بەدڕەفتاریدا چێژم وەردەگرت و حەزم لەو جۆرە ژیانەبوو. هەرگیز عەیبداربوونمان لەلایەن خەڵکییەوە بەگرنگ دانەدەنا. تەنها شتێك کە بیرم لێکردبێتەوە بێ یاسایی، ئازادی ڕەها و نەبوونی کۆسپ لەبەردەم حەز و ئارەزووەکانمدا بوو.

لێرەدا دەمەوێت هێڵ بهێنم بەژێر ڕاستییەکی تردا، لەڕاستیدا بەو سەرشێتی و ڕابواردنانەی بەناوی بەدەستهێنانی ئاسودەیی وکەیفی ژیانەوە دەمانکرد، ئاسودەییمان دەست نەدەکەوت، تەنها خۆمانمان هەڵدەخەڵەتاند، چونکە سەختترین ژیان ژیانی بێ ئامانج و بێ سەروبەرییە، چی لەوە کەیف ڕزێنتر و شادی ڕفێنترە کە ئادەمیزاد نەزانێت چی دەکات، بۆ کوێ دەچێت؟ بۆچی هاتووە و چۆن بژی؟!

تەنانــەت لــەکاتی –حاشــا– ئینکــاریکردنی خــوا و دیــن و ئاخیرەتیشدا، لەناخمدا شۆڵەیەکی ئیمان هەبوو کە نەمدەتوانی زاڵبم بەسەریدا و ڕێی لێبگرم. بەڵام هەوڵم دەدا ئەم شۆڵە ئیمانییە زایەڵە ناسکە نەبیستم و هەستی پێ نەکەم.

لەڕاستیدا هەندێك لەو پرسانەی کە لەمێشکمدا دەهاتن و دەچوون و سەرقاڵیان کردبووم لە هەندێك مامۆستا و کەسایەتی ئاینیم کـرد، جا لەبەرئەوەی وەڵامی ئەوان بۆ مـن بـەو جـۆرە نـەبوو کـەمن دڵنیـا بکات، بۆیە ئینکاریی و بێباوەڕییم زیادی دەکرد.

دەموت: «کەواتە نییە، ئەگەر ببوایە وەڵامێکـی گونجـاو بەعـەقڵ و ژیرییان دەدامەوە»

بەڵام ناسینی تـۆ بـوو بەیەکـەم هـەنگاوی گەڕانـەوەم. ئـەوەی کـە زیـاتر کـاری لـە مـن کـرد ئـەوەبوو بەڕوومـدا نەهاتیتـەوە و لەئاسـت ڕەفتـاری زبـر و لاسـاریی بـێ پـەروای منـدا تـۆ شـێوازێکی نـەرم و هەسـتێکی بـەرز و خۆشەویسـتییەکی پـاك و ڕێزێکـی بـەرزت نوانـد، منیش ئەوکات زۆر شـەرمەزاربووم و لەناخـەوە هەسـتم بەخەجاڵـەتی دەکـرد، ئـەو هـەموو ڕێـز و بایەخـەی کـە لـەکاتی دەربڕینـی بیروبۆچوونەکانمدا بۆمنتـان دادەنـا، گوێبیسـت بوونتـان تاکۆتـایی و نرخاندنی بـیرو دیـدەکانم، هـەموو ئەمانـە بوونـە هـۆی دروسـتکردنی وابەستەگی و سۆزێك لەبەرامبەر ئێوەدا (مامۆستای ئازیزم)، چـونکە بەهۆی هەڵسوکەوتە بێماناکانمەوە تاکو ئەو ڕۆژەش هیچ مامۆستایەك

بەڕوویەکی گەشەوە تەماشای نەکردووم و، بایەخیان پێنەداوم، بەهۆی ئەمەوە ڕووبەڕووی ڕەفتاری جیاواز دەبوومەوە.

بەتایبەتی ناسینی ئێوە و بەشداریکردنم لەگفتۆگۆکانتدا، بوویە مایەی هاتنە دونیای ژیانێکی نوێ، هەناسەیەکی سەوز لەمەملەکەتی هزر و دەروونمدا، دونیایەکی ناوازەبوو.

بەتایبەت لەیەکەم گفتۆگۆماندا پێشەکییەکت باسکرد کە هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە.

(هەموو بوونەوەر هەرچی لەناویدایە هەموو لەخزمەتی مرۆڤدان، هاوکاریی مرۆڤ دەکەن و بۆ ئەو ڕامهێنراون و، پاڵپشتیی بوونی مرۆڤ دەکەن، ئایا دەبێت بۆ چ مەبەست و ئامانجێك ئەو هەموو نیعمەتە بێ بەرامبەرانەی بەسەردا ڕژێنرابن)؟

ئەم پارچە بچووکەی کە بەنموونەیەك ڕازاندبووتەوە وەك هەورە بروسکەیەك دای لەمێشکم، وەك ئەوەی کە یەکەمجار بێت شتی وەها ببیستم و یەکەمجار بێت کە کەشفی مرۆڤ بکەم.

بەدوایدا ئەم پارچەیەتان خوێندەوە:

(مرۆڤ، پەت نەخراوەتە ملی و لەهەر شوێنێکدا بیەوێت گیا بخوات و بێ خاوەن بەجێ نەهێڵراوە، بەڵکو وێنەی هەموو کردارەکانی وەرگیراوە و نوسراوە و، ئەنجامی هەموو کردارەکانیشی بۆ لێپرسینەوە تۆماردەکرێت).[1]

---

[1]- خاوەنی ئەم چەند دێڕە مامۆستا سەعیدی نوورسی یە.

ئەم برگەیە بەتەواوی وەڵامێك بوو بۆ ژیانی من و دووبارە منی هەژاندەوە. بە نموونەی مانادارەوە ڕوونی دەکردەوە کە مرۆڤ بەڕەڵا و بێخاوەن نابێت و لەکۆتاییدا لێپرسینەوەی دەبێت. ئیتر سەرەتای گەڕانەوەم بەم جۆرە بوو. گفتوگۆکانمان و ئەو پەرتووکانەی لە ئێوەم وەرگرت، ئەو نزیککەوتنەوە گەرم و ستایش کردنەت، دڵی فەتحکردم. بەتایبەت لەیەکەم سەردانمدا بۆ ژوورەکەت و هەستانە سەرپێ و پێشوازیی لێکردنم، هاتنتان تا لای دەرگاکە لەکاتی خواحافیزیداو، پێشکەشکردنی چا بەدەستی خۆتان، وای لێکردم کە لەکاتی گفتوگۆکاندا زۆربەوردی و گرنگیدانەوە بە بابەتەکانی ئێوەوە پەیوەست ببم و شێوازی ڕووخۆشی و نزیکبوونەوەی دڵسۆزانەتان سەرنجی ڕاکێشام، ئاخر لەدونیا و ژینی مندا ئەمانە بوونێکیان نەبوو!

کتێبی «ئەو پیاوەی لە دووی خۆی دەگەڕێت» یەکێك بوو لەکتێبە هەرە بەنرخ وگرنگەکان، ئەم کتێبە بێ وێنەیە بوویە وەڵامگۆی زۆرێك لەو پرس و ئاڵۆزییانەی کە لەهزرمدا کەڵەکە ببوون. پێویستە هەموو گەنجێك ئەم کتێبە بخوێنێتەوە، تەنانەت ئەگەر بکرێت، پێویستە بەفیلم پیشانی هەموو لاوان بدرێت.

بە خوێندنەوەی (پەیامەکانی نوور) بە هەموو واتایەك ڕێم کەوت لە ڕاستییەك.

من بەندەیەکم، من دروستکارم هەیە، لەسەر ئەنجامدانی هەر کارێك پاداشت وەردەگرم. ئەمە دیاریکردنێکی زۆر گرنگە بە بەڵگەی ژیریی و زانستیی و فەلسەفیی، بەجۆرێك کاریکردە سەر ناخم کە دەستمکرد بە نەفرینکردن لەو ژیانە بێسەروبەرەی کە بەسەرم بردبوو. زۆر زوویر و تووڕە بووم لەو مامۆستا و هاوڕێ و دەوروبەرەی کە منیان گەیاندبووە ئەم بارە. چونکە ئەوان ئێمەیان لەناوبردبوو.

بەڕاستی هیچ شتێك ئەوەندەی بەندایەتیکردن بۆ خوا و گوێڕایەڵیکردنی، ئاسودەیی و خۆشیی نابەخشێتە مرۆڤ، کڕنووش بردن بۆی و پشت بەستن پێی، داواکردن لەو، پەناگرتن بەو، ئاسودەییەکی وا دەبەخشێت کە لە باسکردن نایەت.

ئای مەرگ، بۆ گەیشتن بەئاسودەییەکی وەها پەنامان بردە بەر کێ و چاوەڕوانی کۆمەکیمان لەچی دەکرد!

ئەمە زۆرباش تێگەیشتم کە تەبایی خێزان و کۆمەڵگا و دەوڵەت پەیوەندیی ڕاستەوخۆی هەیە بە باوەڕی مرۆڤەکانەوە و تەسلیم بوونیان و باوەڕبوونیان بە ئاخیرەت. ئایا کەسانێك کە باوەڕیان هەبێت بەوەی لەسەر بچوکترین هەڵە لێپرسینەوەیان لێدەکرێت، دەتوانن زیان بەکێ بگەیەنن؟ کام یاسایە پێشێل بکەن؟ چەك بەرامبەر کێ هەڵبگرن؟ دەستیان دەچێتە خوێنی کێوە؟ دەتوانن ئازاری کێ بدەن؟

ئەگەر لەکۆمەڵگادا پاشاگەردانیی و نائارامیی نادادگەریی و ستەم و پێکدادان هەبێت. ئەوە دەگەیەنێت کە مرۆڤەکان ڕاستەڕێیان وێڵکردووە و لەبیریان چووە کە بەندەن، بۆچی هاتوون و نرخی هەموو ئەمانە دەدەن؟ کەواتە ئایا دەگونجێت مرۆڤ و کۆمەڵگا بەجۆرێکی دی بهێنرێنە ژێربار؟

من ئەمە بەڕوانین لەژیانی خۆم زۆرباش تێدەگەم.

گەورەترین کۆنترۆڵ و ئاسایش هەستی لێپرسینەوە و جڵەوگیریی ناو دەروونی مرۆڤ خۆیەتی. گەردوون لەپێناوی مرۆڤدا هاتووەتە بوون. ملیۆنەها نیعمەت و بەخششی ناو گەردوون بۆ مرۆڤ دەفراهێنرێت، گشت دروستکراوەکانی خزمەتی مرۆڤ دەکەن، باشە مرۆڤ لەئاست ئەم هەموو خەرجییە بێ بەرامبەرەدا چی دەکات؟ ئەرکی چی دەبێت؟ چۆن ژیانێك بەسەر دەبات؟ پەیوەندییەکانی، ڕەفتارەکانی و ئەرکەکانی دەبێت چی بن؟ دەی پێویستە ئەمانە بۆ لاوەکان باس بکرێت و کاریان بۆ بکرێت، پێویستە ڕوون بکرێتەوە تا مرۆڤ بزانێت چلۆن بەهاو ڕاسپاردەیەکی لەئەستۆدایە، ئەم پاداشتە چۆن و بەکێ دەدات؟

((پەیامەکانی نوور)) ئەو پەڕاوانەن کە من خوێندومنەتەوە و زۆر سوودمەندبووم لێیان و لەم سۆنگەیەوە لەبابەتەکان دەڕوانێت و بەها ئیمانییەکان بەم میتۆدانە شیکار دەکات.

لەبەر ئەمەیە کە ڕاڤەیەکی قورئانیی زۆر خوێندراوەیە.

سوپاس بۆ خوا، بەدیهێنەرەکەمم ناسی، تێگەیشتم لەئەرکەکانم، هەستم بەفانییەتی دونیاکرد. بینیم کەوا زۆر بەخێرایی لەشوێنی لێپرسینەوە و ڕۆژی لێپێچینەوە نزیك دەبمەوە، تەمەن کورتە، ئەرکەکانیش زۆرن، بۆیە پێویستە تەنها ساتێکیش بەهەدەر نەڕوات. هەموو کاتێك ڕووبەڕووی مردنێکم کە هەرکاتێك بیەوێت دێتەڕێم، پێویستە زۆرباش ئەو شتانە بزانم کە مردن لێم داوادەکات، دەبێت بزانم و بەپێی ئەوە خۆم ئامادە بکەم، هیچ کارێکیش لەمە گەورەتر نییە، لەوەو پێش زۆر لەمردن دەترسام، کاتێك یەکێك باسی مردنی بکردایە یەکبینە لەوشوێنە دوور دەکەوتمەوە، وەك ئەوەی بڵێیت بە ڕاکردن لە مردن قوتار دەبووم، یان بەدوورکەوتنەوەم جەللادی مەرگم لەخۆم دووردەخستەوە.

ئێستاکە مردنم زۆر خۆشدەوێت، بۆچی بترسم لەمردنێك کە من بەپێغەمبەری ئازیز ﷺ و هەزاران کەسانی پیرۆز دەگەیەنێت؟ چونکە وەك بدیع الزمان (سعید نورسی) دەفەرموێت:

« مردن بلیتێکە، جێ گۆڕکێیەکە، ژوانێکە مرۆڤ بە دۆست و خۆشەویستانی دەگەیەنێت ئایا هۆکارێکی لەمە جوانتر دەبێت؟ »

مامۆستای بەڕێزم، زۆر درێژەمدا بە نامەکەم و دەمەوێت بەو وتانە کۆتایی پێبهێنم:

من ئیمانم بەخوا و دوارۆژ، قورئان و پێغەمبەر ﷺ هەیە و باوەڕم پێیەتی، مامۆستا ببە بەشاهیدی ئەم باوەڕەم.

ئەم نامەیەم بۆئەوە نوسیوە کە لەو دونیا لەبەردەم پەروەردگارمدا ببیتە گەواهیدەری ئیمانەکەم، دەسا شەرمەزارم مەکە، خوا ئێمە لەبەهەشتی بەریندا لەگەڵ هەزاران کەسانی پیرۆز و بەڕێزدا گرد بکاتەوە گەردنم ئازاد بکە، بەڕێزەوە دەستەکانت ماچدەکەم.

قوتابیت

محەمەد دوزجەیی

١٩٩٩/١١/١١

## خەونێکی زۆر داچڵەکێنەر
## کە بە محەمەدەوە بینرا

دوای کۆچی دوایی محەمەد، زۆرێك لەقوتابییەکانم کە خەویان بە محەمەدەوە دەبینی خەونەکانیان بۆ دەگێڕامەوە، یەکێك لەوانەی کە زۆر پەندبەخشەو شایانی تێڕامانە بۆتانی باس دەکەم.

یەکێك لەهاوڕێکانی محەمەد و لەهەمان کاتیشدا قوتابی من کە ناوی مستەفایە، خەو بەمحەمەدی خوا لێخۆشبووەوە دەبینێت.
مستەفا دەگێڕێتەوە کە: لەخەونیدا لەگەڵ زانای زۆر بەڕێز (مامۆستا علی سەرت)دا کە لە(کرك خان) دەژیا پێکەوە دەچن بۆ گەشتێك.
دەگەنە شوێنێك کە بێ وێنە و سەرسوڕهێنەرە، جوانی و خۆشی ئەوێ مستەفا لەهۆش خۆی دەبات.

دەپرسن ئەمە کوێیە؟

پێیان دەوترێت: (ئەم شوێنە شکۆدارە هی بەدیعوززەمان (سەعید نورسی و قوتابییەکانیەتی). بەگەرم و گوڕییەوە دەچنە ژوورەوە...
پاش کەمێك لەبەردەم کۆشکێکی زۆر مەزندا ڕووبەڕووی جەنجاڵییەك دەبنەوە، کە سەیردەکەن لەبەردەم جەنجاڵییەکەدا (بەدیعوززەمان سەعیدی نورسی و قوتابییەکانی)...

مامۆستا نورسی زۆر گرنگی دەدات بە مامۆستا علی سەرت، بە مستەفاش دەڵێت: (بەخێربێیت مستەفاکەم)، ئەوجا دەست دەهێنێت

بەسەریدا، لەتەنیشت مامۆستا نورسیدا قوتابییەکانی بەناوی: زوبەیر گوندوزالپ، بەیرام یوکسێڵ و، خولوسی یەحیاکیل بەدی دەکران. لەوکاتەشدا محەمەد دوزجەیی دەردەکەوێت.

محەمەد دوزجەیی لەتەنیشت زوبەیر گوندوزالپ وەك بلێیت خۆی دابێتە پەنای ئەو، چاوەڕێی دەکرد، کە محەمەد لەوێ مستەفا دەبینێت بارەشی پێدادەکات، قوتابییەکەی مامۆستا نورسی (زوبەیر گوندوزالپ) بەئاماژەکردن بۆ مامۆستا (علی سەرت) بە محەمەد دوزجەیی دەڵێت: « سەیرکە محەمەد، ئەم زاتە کەسێکی زۆر زانا و بەڕێزە، لەهەمان کاتیشدا مامۆستای مامۆستاکەتە ».

محەمەد دوزجەیی بەدڵگەرمییەوە دەستی مامۆستا (عەلی سەرت) ماچ دەکات و سڵاو دەنێرێت بۆ مامۆستاکەی. مستەفا دێت بۆلای محەمەد دوزجەیی و دەڵێت: (ئێمە زۆر نیگەرانی تۆ بووین و زۆر گریاین بۆت زۆر خەفەتمان خوارد بەکۆچی دوایی تۆ و خێزانەکەت) محەمەد دوزجەیی لەوەڵامدا:

– هەمووکەس بەمنیان دەوت مردووە، سەیرکە من نەمردووم ئێمە هەموو پێکەوە (بەخێزانی) هاتووین بۆ سەردانی مامۆستاکەمان بەدیعوززەمان (سەعیدی نورسی) خێزانەکەشم لێرەیە. ئەم وەرزە لێرە بەسەردەبەین ودووبارە دەگەڕێینەوە.

« سەلام بگەیەنە هاوڕێیان، مامۆستاکەم. ئێمە نەمردوین، دەژین، زۆر بیریان دەکەم دووبارە دەگەڕێینەوە و بەیەکتر شاد دەبینەوە.»

لـەم کاتـەدا کـە لەگـەڵ محەمـەددا دەدوێـت، مسـتەفا بەخەبـەر دەهێنرێتەوە.

بـەم بەسـەرهاتی گەنجـە کـە ژیـانی بـەڕابواردن و ئینکـاریکردن بەسەردەبرد، دوای ئەوەی کە قورئان و ئیمانی ناسی بوویە کەسێکی سـوودبەخش بـۆ کۆمەڵگـە و گەڕایـەوە و شـەهید بـوو. دواتـریش هاوەڵێتی کێی بووە بەش و بوویە هاوگەشتی کێ؟ دیارە وانەیەکی پڕ لەپەنـد و ئامۆژگارییـە بـۆ ئێمـە کـە دەژیـن. ئـەم وانەیـە، پێویسـتی سەرەکی و بوژێنەرەوەی پڕ بایەخی گشت لایەکمانە.

## نامەیەکی بەهەند دەربارەی محەمەد دوزجەیی

مـن وەك مامۆسـتای محەمـەد دوزجـەیی، چـەند نیگـەران بـووم، هاوەڵانیشـی ئەوەنـدە و ئەوەنـدە دڵگـران بـوون، دوای مەرگەسـاتی محەمەد و خێزانەکەی لەڕووداوی زەمین لەرزەکەدا، هاوڕێیـانی پرسـە و سەرەخۆشـی خۆیـان ئاڕاسـتەی مـن دەکـرد، بەوپێیـەی کـە مامۆستایان بووم هاوخەمی خۆیان دەردەبڕی، پەیوەنـدی تەلـەفونی بەجۆش و نامەی هەست بـزوێن و نـاخ هـەژێنم بـۆ دەهـات سـەبارەت بەشەهیدبوونی محەمەد لەژێر دار و پەردووی ڕووخاودا، کە هـەر هـیچ نەبێت دەمەوێت یـەکێك لـەو نامانـەتان وەك نموونەیـەکی بەڵگـەداری پەندئامێز بخەمە پێش چاو.

بـاوەڕم وایـە، لەخوێندنـەوەی ئـەم نامەیـەدا، خۆتـان جـارێکی تـر دەخەنـەوە بـەر لافـاوی ئـەم هەسـتە و تەوژمـەکانی، ئـەویش جارێـك

بەرەو ئەم کەناری پەندە، جارێکی تر بەرەو ئەو ڕۆخی پەژارەیە سەمای شین و قوڵپی دەروون دەسازێنێت. جارێکی تر فرمێسکە محەمەدییەکانتان لەزیندانی دیدەتانەوە بەرەو گۆناتان دەردەپەڕێت و سەرلەنوێ خانەی ئازادیی لەدوتوێی هەر ئەسرینێکدا محەمەدێکی تازە سەردەردێنێت.

بۆ زۆر گەورە و بەڕێزم مامۆستا خالید:

جەنابتان وەك یەکێك لەو مامۆستا دەگمەن و ناوازانەی کە لەژیانمدا لەناخمەوە ڕێزی بێ پایانم هەیە بۆیان، لەگەڵ ڕێز و حورمەتمدا دەستەکانت ماچ دەکەم، هەوڵمدا سۆزەکانم، هەستەکانم، ئازارەکانم و سەرسوڕمانەکانم بەتەلەفونێکی درێژ پێبگەیەنم، بەڵام بەدرێژایی گفتوگۆ لەبەر قوڵپەی گریان نەم دەزانی کە چیم باسکردووە.

ئەو یادگارییانەی کە هەوڵمدا بۆتانی باس بکەم، لەسەر ویستی خۆت، تاکو ببێتە نموونە بۆ کەسانی تریش لەسەر کاغەز دەینووسم. داڕشتنی ئەم یادگارییە لەسەر کاغەز زۆر گرانە چونکە ناتوانم ببمە بەربەست لەبەرامبەر ئەو هەستانەی کە لەقوڵاییەکانی ناخمەوە هەڵدەقوڵێن و ڕێگریش لەسێڵاوی ئەسرینەکان ئەستەمە و زیاتر لە ئەستەمە. دڵنیام ئەگەر خوا مرۆڤ لەحاڵەتی وەهادا بژیەنێت، پێویستە بۆ وانە و پەند لێوەرگرتن بێت. ڕووداوی محەمەد دوزجەیی تەنها بەسەرهاتی گەڕانەوە و وەفاتی نییە، ئەو ڕووداوە ئەوەندە

پەنددار و، ئەوەندە کاریگەر و سوتێنەر و ناخ هەژێنە کە هەرکەس گوێی لێڕاگرتایە و ببوایە بەشاهیدیان و، لەنزیکی ڕووداوەکەوە بوایە سوێی دەبووەوە و لەهۆش خۆی دەچوو.

مامۆستا ئێوە دەزانن کە من هاوڕێی پۆلی محەمەد بووم، بۆ ماوەیەکیش لەسەر هەمان مێز دادەنیشتین، واتە من یەکێك بووم لەو هاورێ نزیکانەی کە زۆر باش دەمناسی و لەنزیکەوە چاودێریم دەکردو ئاگام لەگەڕانەوەکەی بوو.

محەمەد دوزجەیی هاوڕێیەکی کۆچەریی بولگارستانمان بوو، خاوەن جەستەیەکی بەهێز و بونیادێکی پتەو بوو، زۆر چاو کراوە بوو، قسەی نەدەخواردەوە و شەڕەنگێزبوو، زۆر سەرەڕۆیی دەکرد، بێ باوەڕێکی تەواو بوو، لەڕووی باوەڕەوە هیچ شتێکی نەبوو، زۆر بەئاشکرا دەریدەخست کە ئایینی خودا نییە پێویستیش بەو ئایینە ناکات. کاتێك ئێمە سەرمان دەخستە سەری دەیوت:

«قسەی زل و پوچ مەکەن، هەولّدەن قایلم کەن» و ئێمەی شەرمەزار دەکرد. زۆری دەخوێندەوە، زانست و ڕۆشنبیریی زۆر زیادبوو، بە تایبەتی کاتەکانی خوێندنەوەی بە موتالاّکردنی پەرتووکە فەلسەفییەکان بەسەردەبرد. هەندێ مامۆستا و هاوڕێی بوونە هۆی ئەوەی کە وا بە بێ ئیمان و بێباوەڕ پێبگات، بەلاّم زۆر مەرد و قسە ڕاست و هاوڕێیەکی زیرەك بوو. تا بلّێیت کەسانی دەوروبەری زۆربوون، بیروبۆچوونەکانی لەدەوروبەرەکەیدا بلاّودەکردەوە، من

لەگەڵ خۆیدا چەندەها جار بەشەڕ هاتووم. مامۆستا، وەك دەزانن من هەم کاردەکەم و هەم دەخوێنم، چەند ساڵ لەخوێندن دواکەوتم. وادەزانم کە لەتەمەندا لەمحەمەد گەورەتر بووم، لەبەرئەوە بەرامبەر بەمن هەندێك ڕێزی دەنواند، تۆی زۆر خۆشدەویست، لەهەموو دەرفەتێکدا پەسەندیی و سەرسوڕمانی خۆی دەردەبڕی و دەیوت:

ئەو کەسەی کەدەبێت بەمامۆستا و بۆچوونەکانی دەرببڕێت و گفتوگۆ دەکات مەرجە وەك مامۆستا خالید بێت. لە یەکەم وانەدا تێ نەگەیشتین کە بۆچی پشتیوانیی محەمەدتان کرد و ستایشتان کرد، بۆچی بێدەنگ بوون بەرامبەر بەڕووبەڕووبوونەوە ڕەقەکەی؟ ئینکارییەکەی و بیروبۆچوونە بێباوەڕییەکانی، بۆچی نەتانشکاند و بێدەنگتان نەکرد؟ دواتر تێگەیشتین، هەستمانکرد کە ئەمە شێوازێکی زانستییانەیە، سەرەتا بە ستایشکردنی دۆستایەتیتان دروستکرد و دواتریش ڕاستییەکانتان تێگەیاند، لەئەنجامدا بەدەستتان هێنا بۆکۆمەڵگا و دین.

گەڕانەوەی محەمەد دوزجەیی زیاتر کاریگەریی لەسەر پۆلی ئێمە هەبوو. ئەگەر لەبیرتان بێت زۆربەی کچە هاوڕێکانمان بوونە باڵاپۆش، هەندێك لە هاوڕێیان دەستیانکرد بەنوێژ، بەتایبەتی ئەوانەی کە پێشتر بیروباوەڕیان هەبووە، بەڵام ژیانیان زۆر چاك و ڕێك نەبوو. ئەم ڕووداوە زۆر کاری لێکردن. ڕوویەکی ڕووداوەکەی محەمەد دوزجەیی

لەمن دەڕوانێت، لەڕاستیدا دەمویست ئەم بابەتە لەگەڵ ئێوەدا باس بکەم گەورەترین یادگاری ژیانم ئەم بەشەیەتی:

مامۆستا، کاتێك هاتم بۆ زانکۆ، تازە ژنم هێنابوو خێزانەکەشم وەکو خۆم فەرمانبەر بوو، لەبەرئەوەی کە خۆم کەمێك باوەڕم هەبوو دەمویست خێزانەکەشم پەرستشەکان ئەنجام بدات، بەڵام خێزانم بەهیچ جۆرێك نەدەچووە ژێرباری فەرمان و پەرستشەکانی پەروەردگار، بەو هۆیەوە هەر لەیەکەم ڕۆژەوە لەماڵمانـدا بە نائاسودەیی و ئاژاوەوە دەژیاین، چەندەها جار لەلێواری جیابوونەوە گەڕاینەوە، لەهەموو نوێژێکمدا لەخوا دەپاڕامەوە و بۆ ڕزگارکردنی ئەم هێلانەیە نزام دەکرد، ئیتر ڕووداوەکەی محەمەد دوزجەیی وەکو حەزرەتی خزر فریای ماڵی ئێمەش کەوت.

ڕووداوێکی باوەڕ پێنەکراو ڕوویدا...

لەگەڵ هاوسەرمدا لە (٢٩)ی نیسانی (٢٠٠٠) ڕۆژی شەممە بڕیارماندا کە بۆ گەڕان بچینە باخچەیەکی گشتی، کاتێك ڕووەو باخچەکە ڕۆیشتین بۆ کڕینی ڕۆژنامەیەك چوومە بینای ڕۆژنامەکەوە، لەوێ چاوم بە (حیلمی دوزگون) کەوت کە هاوڕێیەکی پۆلم بوو، مامۆستا ئێوەش لەبیرتان دێت؟ لەدەستیدا کتێبێك بەناوی (ژیانێکی نوێ) دەبینرا کە بەرهەمێکی تازەی ئێوە بوو دەرچوو بوو و وتی: جەمیل لەم کتێبەدا مامۆستا خالید باسی ژیانی محەمەدی کردووە، زۆر کاری تێکردووم، کاتێك ناوی محەمەدی برد زۆر بەپەرۆش بووم ،

وتم:(ئەگەر خوێندوتەتەوە بێنە با منیش بیخوێنمەوە)، کتێبەکەم وەرگرت، لەناو پەرۆشیمدا ڕۆژنامەکرینم لەبیرچوویەوە و گەڕامەوە بۆلای خێزانەکەم. چەندەها جار باسی محەمەد دوزجەییم بۆ خێزانەکەم کردبوو تاکو هەندێك کاریگەریی هەبێت لەسەری، بەڵام هیچ بایەخی نەبوو. کتێبەکەی لە دەستم وەرگرت، سەرەتا ژیانی ئێوەی خوێندەوە. دوای ئەوەی کە قەناعەتی هێنا کە جەنابتان مامۆستایەکی خاوەن بەرهەمانێکی گرنگ و سەرکەوتوون ئەوجا هاتەسەر محەمەد دوزجەیی، منیش بۆ ئەوەی گرنگیی پێبدەم، وتم: بەدەنگی بەرز بیخوێنەرەوە با پێکەوە سوودمەند ببین منیش تامەزرۆیم، شتانێکی زۆر هەن کە نایانزانم، هاوسەرم بەدەنگی بەرز دەستیکرد بەخوێندنەوە، منیش گوێم لێڕاگرت و لەناخیشمدا دەپاڕامەوە و دەموت: (خوایە کاریگەریی لەسەر هاوسەرم درووست بکە، ئەویش بەئاگا بهێنەرەوە و هێز بەئیمان و باوەڕی بدە)

ڕووداوی محەمەد دوزجەیی ئەوەندە پڕپەند و وانە بوو کە نەدەکرا کاریگەریی خۆی نەبێت؟

لەگەڵ خێزانمدا پێکەوە دوای ڕووداوەکان کەوتین، من تەماشای ئەوم دەکرد چاوەکانی تەڕ بووبوون، ئەویش تەماشای منی دەکرد چاوەکانم تەڕ بووبوون. بۆ یەکەمجار خێزانم بینی بەرامبەر ڕووداوێکی ئیمانیی کاریگەر بێت و لەخۆشیدا بەردەوام بووم لەپاڕانەوە لەخوا، ئاخر چۆن پێم خۆش نابێت، چۆن خۆشحاڵ نابم

مامۆستا، ئەوەندە مەبەستم بوو کە فەرمانەکانی خوا و پەرستشەکان ئەنجام بدات کە ناتوانم باسی بکەم.

بەڵام بۆئەوەی کاردانەوەی لا دروست نەبێت، هیچم نەوت، با خۆی بۆخۆی ڕووداوەکە هەڵسەنگێنێت، خوای گەورە دوعاکانمی قبووڵ کرد. محەمەد دوزجەیی تەنها بە شەهید بوون و ڕزگارکردنی پاشەڕۆژی خۆی نەوەستایەوە، بەڵکو ئاسودەیی و خۆشگوزەرانیی ماڵی ئێمەشی ڕزگارکرد. دووەم ڕۆژ واتە (٣٠) نیسان (٢٠٠٠) بەرەبەیانی ڕۆژی یەك شەممە بۆ یەکەمجار هاوسەرم وتی: (هەستە جەمیل بانگە)و منی بەئاگا هێنا، هەستام دەستنوێژم گرت، دواتر خۆیشی بەدوامدا هات بەجۆرێکی چاوەڕوان نەکراو، وتی: (جەمیل منیش نویژ دەکەم)، ڕۆیشت بۆ دەستنوێژگرتن. ئەی پەروەردگاری مەزنم، ئەمە چ سۆزێکی گەورەیە، ئەمە چ خۆشییەکی لەستایش نەهاتووە؟! لەپەرۆشیدا دەست و قاچم بەیەکدا هات و لەسەر قەنەفەکە دانیشتم و دەستمکردە گریان.

ئەی خوایە هەمیشە گریانی خۆشی لەم جۆرە بکەیت بەنسیبمان، چەندەها ساڵە ئەو ئاژاوە و دڵتەنگییەی ماڵەکەمانی داگیرکردبوو، بەهۆی کاریگەریی ژیانی پەندار و پڕسۆزی محەمەد دوزجەییەوە گۆڕا بۆ لانەیەك لەسۆز، خانەیەك لەمیهر و کامەرانیی. مامۆستا، چەند دوعا بۆ ئێوە بکەین، ئەوەندەش دوعای میهر و بەخشندەیی بۆ محەمەد دەکەین، ئەو ژیا، شەهید بوو، ڕۆیشت، بەڵام ئەو

یادگارییانەی کە لەدوای خۆی بەجێی هێشتوون ئاراستەی مرۆڤەکان دەکات و بەردەوامە لەگۆڕینی ژیانی ئەوانیشدا.

مامۆستا دەخوازین لە کۆتایی هەفتەیەکدا کە کاتتان هەبێت میوانداریتان بکەم، ئەگەر کاتمان بۆ تەرخان بکەن زۆر دڵخۆش دەبین، دەستەکانت ماچ دەکەین، لەگەڵ هاوسەرم نیازمەندی دوعای خێرتانین.

جەمیل ئاکتاش

٢٠٠٠/٥/١

# پێڕست

# DÜZCELİ MEHMET

## HALİT ERTUĞRUL

"محمدی دوزجەیی" بەسەرهاتی گەنجێکە کە لەسەرەتای ژیانیدا لەنێو گێژاوی بێباوەڕی و گومڕاییدا دەژی، بەڵام دوای ئەوەی کارەساتێکی بەسەردا دێت، دەبێتە خاڵی وەرچەرخان لە ژیانی ئەو گەنجەداو لە بێ باوەڕی و ئامانجی دنیایی ڕزگاری دەبێت.
ئەو کارەساتە بەتەواوی ژیانی ئەو گەنجە دەگۆڕێت، دەبێتە کەسێکی جیاواز ، ژیانێکی پەری ئاسا بەسەردەبات.
بەتەواوی تێڕوانینی بۆ ژیان و ڕووداوەکان دەگۆڕێت، بەجۆرێك کە هەموو ڕۆژانی ژیانی بە پەرستش و تەوبە و داوای لێبوردنەوە بەسەردەبات. جا بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە، هەم چارەسەری کێشەکانی گەنجان دەدۆزیتەوەو هەم لە جۆش و خرۆشی ڕووداوەکانیدا تاسەمەند ئەبی و چەندین وانەی بیرنەچوو و سوودبەخش فێرئەبیت.
ئەم بەرهەمە هەوڵێکە بۆ لە ئامێزگرتنی هەموو ئەو گەنجانەی کە ئیمانیان لەدەست داوە، لە ژیان تۆراون و لە کۆمەڵگا یاخی بوون، هەنگاوێکە بۆ گێڕانەوەیان بۆ نێو کۆمەڵگا و چاکسازی کردن لە تەکیاندا.

ISBN 0-0002-0000-X
9 780000 200006
نرخی (٣٠٠٠) دینارە

ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا
ARA Media Center
www.aramediacenter.com
info@aramediacenter.com

